3

# باپیرە نوور

# فێرمان دەکات



محمد پاکسو





ناوی کتێب: باپیرە نوور فێرمان دەکات

بەرگی سێیەم

نووسەر: محمد پاکسو

وەرگێڕ: دۆستی عوسمان

پێداچوونەوە : بەفراو جەمال

چاپ: یەکەم – ٢٠١٥

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٥١١)ی ساڵی ٢٠١٤ ی پێ دراوە




بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا – سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669 ara.m@hotmail.com

# حیکمەتی شوانێتی

## کەڵەشێر و دایکایەتی مریشك



"کەڵەشێر کاتێك خۆراکێك دەدۆزێتەوە، تەنانەت گەر خۆشی برسی بێت، سەرەتا مریشکەکان بانگ دەکات و، ئەوان پێش خۆی دەخات. مریشکیش هەمیشە دەڵێی شوانی جووجەڵەکانی خۆیەتی و، گیانی خۆی دەکاتە قوربانییان و، بۆ پاراستنیان تەنانەت لە سەگیش سڵ ناکاتەوە.. گەر بەچکەکانی تێربن، زۆر گوێ ناداتە برسییەتی خۆی. کەواتە ئەوان هێندە چێژ لەو خزمەتە دەبینن کە سەرەڕای نارەحەتی و برسێتی و ئازاری مەرگ هەر ئەو خزمەتە هەڵدەبژێرن و، بگرە پێشیان خۆشە".

ئێوەش کەڵەشێرتان بینیوە، ئەها چوار پێنج مریشکی لەدەورە و لەدەوروبەری کولانەکەیان دەگەڕێن.



کەڵەشێری ئێسکسووك و پۆپنە بەرز، سنگی دەرپەڕاندووە و، کلکیشی قیت کردووەتەوە و، بەفیزێکەوە بەناویاندا دەگەڕێت.

لەهەمان کاتدا سەرێ بەلای ڕاستدا و سەرێ بەلای چەپدا بادەدات و، هەمیشە چاودێری دەوروبەرەکەی دەکات.

ئەگەر یەکێك دەستێکی لێ بەرز بکاتەوە و کششەی لێ بکات، یەکسەر بەدەنگە بەرزەکەی دەست دەکات بە قووقەقوق.

جگە لەوەش هەردەم چاوی لەسەر زەوییەکەیە... ئەگەر دەنکە گەنمێك یاخود کرمێکی بەرچاو بکەوێت، یەکسەر بۆخۆی حەپەلوشی ناکات، بەڵکو بە زمانێکی تایبەت بەخۆی مریشکەکانی دەوروبەری بانگ دەکات و خۆی دەکشێتەوە و فەرموو لەوان دەکات. ئەمە لەکاتێکدا کە خۆشی برسییە..

– خۆ خۆی زیاتر پێویستی بەو دەنکە گەنمەیە تا مریشکەکان، ئەگەر بیشیخوات کەس پێی ناڵێت: "ئەرێ ئەم دەنکە گەنمەت بۆ خوارد؟". تۆ بڵێی هۆی چی بێت وا بەم شێوەیە هەڵسوکەوت دەکات؟!

– یەکەم: کەڵەشێر لەم ڕەفتارەی چێژێکی گەورە دەبینێت و، ئەمە کەیفێکی خۆشە بۆ ئەو، واتە ئەو زیاتر حەزی لە نانپێدانە تا نانخواردن.

دووەم: خۆ کەڵەشێر هەر لەخۆیەوە کار ناکات، بەڵکو بەناوی زاتێکەوە دەجوڵێتەوە.. واتە بەناوی ئەو زاتەی کە لە بنەڕەتەوە لە هێلکەیەکەوە بەم دۆخەی گەیاندووە و ئەم ئەرکەی پێ سپاردووە..



واتە؛ کەڵەشێر بێ ئەوەی خۆی عەقڵی پێ بشکێت بەم شێوەیە ڕەفتار دەکات، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە لە ژێر فەرمانی پەروەردگاردا کار دەکات، چونکە کەڵەشێر توانای بیرکردنەوەی نییە لە ئەنجامدانی ئەم کارانەدا.

لە سایەی سۆز و بەزەیی خودادا ئەم ئەرکە بە خۆشەویستی و جۆش و خرۆشەوە بەجێ دەهێنێت.

* * *

دایکەمریشکیش هیچی لە کەڵەشێر کەمتر نییە.

ئەوەتا لەو ساتەوە کە جووجەڵەکانی هێلکەکانیان دەتروکێنن، ئەم دەکەوێتە دوایان و چاوی لەسەریان لانابات.

هەر لەگەڵ شتێکی سادەشی دۆزیەوە دەستدەکات بە گارەگار و، جووجەڵەکانی بانگ دەکات و، تێریان دەکات.. تەنانەت سەرەتا برسییەتی خۆی لەبیر نییە و، هەوڵی تێرکردنی ئەوان دەدات.



دایکەمریشکی خرپن هەر بەم شێوەیە جووجەڵەکانی بەخێو دەکات، تا قۆناغێك کە پێیان دەگەیەنێت و چیتر پێویستیان بەم نامێنێت.

هەر کە جووجەڵەکان گەورە بوون و توانیان خۆراکی خۆیان دابین بکەن، ئیتر ئەرکی دایکەمیشك تەواو دەبێت.

ڕەنگە گەر دواتر بیانبینێت هەر نەشیانناسێت، واتە نەك هەر ئەوەی گەر شتێکی دۆزییەوە بۆخۆی دەیخوات، بەڵکو ڕەنگە شتێکیش بەدەم جووجەڵەکانییەوە ببینێت، دەنووکیان لێ بگرێت و لێیان بسێنێت، چونکە ئەوان گەورە بوون و چیتر یەکتر ناناسنەوە.

ئاخر خۆ ماوەی دایکایەتی مریشك سنووردارە و، وەك مرۆڤ بەردەوام نییە.

* * *

دایکەمریشك لە پاراستنی جووجەڵەکانیدا فیداکارییەکی کەموێنە دەنوێنێت، چونکە لە هەموو مەترسییەکان دەیانپارێزێت.

ئەگەر سەگێك یان پشیلەیەك شاڵاو بۆ بێچووەکانی بهێنێت، ئەوا دایکەمریشك بێ ئەوەی لە بێتوانایی و لاوازیی خۆی بڕوانێت و، سڵ لە بەهێزیی و دڕندەیی ئەوان بکاتەوە یەکسەر هێرشیان دەکاتەسەر.

تەنانەت هەندێ جار گیانی خۆشی دەکاتە قوربانی لەپێناو سەلامەتیی جووجەڵەکانیدا.

لە ڕاستیدا زۆرکەس مریشکیان بینیوە کە بەرهەڵستی سەگی کردووە و، لەبەر جووجەڵەکانی خۆی داوە بەکوشت.

من لە منداڵیدا مریشکم بینیوە کە چەند مەترێك خۆی هەڵداوە و دارلاسیکی[1] لەدەست خۆم و هاوڕێکانم فڕاندووە، تا بەرد نەگرینە جووجەڵەکانی و ئازاریان نەدەین.

– چی وا لە مریشك دەکات گیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە و، سڵ لە هیچ نەکاتەوە و، لەپێناو ڕزگاکردنی جووجەڵەکانیدا بەسەگ و پشیلەدا هەڵبشاخێت؟

– (هەستی دایکایەتی)یە..

---

١– دارلاسیك یا دالاسیك: جۆرە یارییەکی منداڵانەیە، کە بەردی پێ دەگیردرێتە شت.

- بەڵام ئەگەر ئەمە تەنها هەستی دایکایەتیی بووایە، نەدەبوو لەدوای گەورەبوونی بێچووەکانیشی هەر بەم شێوەیە بوایە؟!

بەو پێیەی کە ئەم کارەی بەردەوام نییە، ئەوا مریشکیش وەك کەڵەشێر هەر لە خۆیەوە کار ناکات.

بەڵکو بەناوی ئەو زاتەوە کاردەکات کە ئەو ئەرکی دایکایەتییەی پێ سپاردووە.. خۆی برسی دەکات بۆ ئەوەی جووجەڵەکانی تێر بن، هەروەها لەپێناو پاراستنیاندا هیچ مەترسییەك بۆ سەر گیانی خۆی لەبەرچاو ناگرێت[1].

---

١- لە (بریسکەی حەفدەیەم)ەوە وەرگیراوە.



# پەیوەندی چاوی مێشوولە بە کۆمەڵەی خۆرەوە چیە؟

**"هەمان ئەو بەدیهێنەرەی چاوی مێشوولەی بەدیهێناوە خۆر و ئەستێرەکانیشی بەدیهێناوە، هەروەها هەر ئەو زاتەی میکانیزمی کاری گەدەی کێچی ڕێکخستووە و وەگەڕی خستووە، سیستمی کاری گەلەئەستێرەکانیشی ڕێکخستووە".**

واتە: چاوی مێشوولە کاری وەستایی کێ بێت، خۆریش هەر دەستکردی ئەوە.

کێ گەدەی کێچی ڕێکخستبێت، هەر ئەویش جووڵەی ئەستێرەکانی ڕێك خستووە.

مێشوولە زیندەوەرێکی زۆر بچووکە، دەی دیارە کە چاوەکانیشی زۆر لە خۆی بچووکترن و، ئێمە ناتوانین بەچاوی خۆمان باش بیانبینین.

تا ئەم ساتەمان کەسانێکی زۆر کەم چاوی مێشوولەیان لا گرنگ بووە و، زۆرینەی خەڵکی هەر بەخەیاڵیشیاندا نایەت.

- بۆچی؟

- چونکە جێی بایەخ نییە لایان.. ئەڵێن: ئاخر مێشوولە خۆی چییە، تا لە چاوی بپرسین.

بەڵام کۆمەڵەی خۆر، لە کۆمەڵە هەسارەیەکی زەبەلاح پێك هاتووە، کە ژمارەیان نۆ هەسارەیە و (لەم زەوییەی خۆمان و، عەتارد و، زوهرە و، مەریخ و، موشتەری و ، زوحەل و، ئۆرانۆس و، نیپتۆن و، پلۆتۆ) پێك هاتووە.



بۆ نموونە، تەنها هەسارەی موشتەری (٣١٨) جار لە زەوی خۆمان گەورەترە! جا ئیتر بیر لە گەورە و فراوانیی کۆمەڵەی خۆر بکەنەوە.

- باشە ئەی مێشوولە بەراورد دەکرێت بە خۆر، یان هەسارەکان؟

- ناکرێت ئەو دووانە بەیەك بەراورد بکرێن، چونکە هەرگیز وەك یەك نین و، ناکرێنە دووتای یەك تەرازوو. بەڵام مێشوولەش لەجێ و ڕێگەی خۆیدا پلەوپایەیەکی هەیە....

* * *

ڕاستە کۆمەڵەی خۆر ئەم هەموو هەسارە و مانگەی تێدایە، بەڵام خـۆ مێشـوولەش لـەو کـەمترنابێت، کەواتـە بـا تەماشـایەکی چـاوی مێشوولە بکەین:

چـاوی مێشـــوولە، شـــانەیەکە کـــە لـــە هـــەزارەها وردە چـاو پێکهاتوون، هەر وردە چاوێکیش لە شێوەی شەش لادایە و، هاوینـەی خۆی هەیە و، خاوەنی شانەیەکی ناسکە کـە لـە خانـە قوچـەکییەکان پێك هاتووە.

خانە ڕەنگینەکانیش دەوری دیوی دەرەوەی چاوەکەیان داوە.. لەدیوی ناوەوەش چینی تۆڕەی تێدایە.

بەڕاسـتی ئـەم پێکهاتەیـەی چاوی مێشـوولە زۆر سـەنجڕاکێش و سەرسوڕهێنەرە!

چ ڕێکوپێکییـــەکی نـــاوازە و، چ نەخشەســـازییەکی ورد و بـــێ وێنەیە!

هەزاران وردەچاو، دەبنـە مایـەی ئـەوەی مێشـوولەکە یـەك وێنـە ببینێت.

دەزانم ئێستە هەست دەکەن تێگەیشتن لـەم پێکهاتەیـەی چاوی مێشوولە کەمێك ئاڵۆزە، بـەڵام ئێـوە لـە تایبەتمەندییـەکانی بـڕوانن.. هەروەها لەگەڵ ئەوەی بە ڕووکەش سادە دەردەکـەوێت، بـەڵام ئێـوە

سـەرنجی نـاوەڕۆك و نـاوەوەی بـدەن.. بـا هەسـت بكـەن هـیچ سوودێكیشی بۆ ئێوە نییە، بەڵام هەوڵ بدەن لە هونەرەكەی بڕوانن.

* * *

نیشتنەوەی مێشوولەیەك بەدەستتەوە و، مژینی خوێنەكـەت بـێ ئەوەی هەستی پێ بكەیت و، فڕینی بەرلەوەی بیگریت، خۆی بۆخـۆی كارێكی زۆر سەرنجڕاكێشی دیكەی مێشوولەیە.

كەواتـە مێشـوولە چـەند تایبەتمەندییـەكی زۆر سەرسـوڕهێنەری هەیە كە تەنانەت لە زەوی و خۆر و موشتەریشدا نییە.

لەپێش هەموو شتێكەوە مێشوولە ژیانی هەیە، ڕۆحی هەیە، بۆیە تام دەكات و، دەبینێت و، بۆن دەكات و، هەست بەشتەكان دەكـات و، دەخوات و دەخواتەوە....

چەندین تایبەتمەندی زۆر لەمانەش نـاوازەتر و لەژمارەنـەهاتووی هەیە.

كەواتـە لـەم ڕووەوە مێشـوولە نـەك لـەدوای كۆمەڵـەی خـۆرەوە نییە، بـەڵكو ئەگـەر لەپێشـییەوە نـەبێت، ئـەوا بێگومـان هـیچ نـەبێت هاوشانیەتی..

بـەڵام كۆمەڵـەی خـۆر و مێشـوولەش وەك هـەموو بوونـەوەرێك، چەند خاڵێكی هاوبەش لەنێوانیاندا هەیە:

سەرەتا: بەدیهێنەرەکەیان یەکە، واتە ئەو زاتەی لە نەبوونەوە هێناونییەتە بوون بۆ ئەم جیهانە و خاوەنیانە، زاتێکی تاك و تەنها و بێ هاوەڵە.

بەدیهێنەر و ڕێکخەری یاسا و ڕێساکانی مێشوولە و کۆمەڵەی خۆریش یەکێکە و، هەمان ڕێکوپێکییان هەیە، بۆیە هیچکامیان لە ڕێساکانیان لانادەن و، سەربەخۆ لەخۆیانەوە کارناکەن.

هەر ئەو زاتەی گەدە و خواردن و خواردنەوە و ژیانی مێشوولەی ڕێکخستووە، ڕێساکانی کۆمەڵەی خۆریشی ڕێکخستووە.

هەردووکیان لە هەمان سەرچاوەوە فەرمان وەردەگرن و، ملکەچی دەبن.

هیچکامیان بێسەروبەر و بێ ئامانج نین و، لەخۆیانەوە کار ناکەن، چونکە ناتوانن وا هیچ بکەن، بەڵکو بۆ چ شتێك بەدیهێنرابن هەر ئەوە دەکەن.

ئەم جیهانە پێویستی بە چ جۆرە خزمەتێکی ئەوان بێت، ئەو خزمەتە دەکەن[1].

---

١- لە (مەکتووبات، نارکەکانی حەقیقەت) ەوە وەرگیراوە.

# چۆن دەتوانین تەمەنمان درێژ بکەین؟



"مرۆڤەکان! ئایا دەتانەوێت تەمەنی فانی و کورتتان بکەنە

تەمەنێکی باقی و، سوودبەخش و، بەرهەمدار؟

مادام دەتانەوێت تەمەنتان وا بێت، کەواتە لەرێگەی زاتی (باقیی

ڕاستەقینە)دا بەسەری بەرن".

تەمەنی مرۆڤ گەلێك کورتە. زۆر بژی پەنجا، شەست، تۆ بڵێ حەفتا، یا هەشتا ساڵ دەژی. لەم سەردەمەدا کەسە سەدساڵەکان، بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن.

ئەگەر کەسێکمان لە حەفتا ساڵ زیاتریش بژی، ئەوا وردەوردە ژیانی کەسانی دەوری ناڕەحەت دەکات و، دەبێتە بارێکی یەکجار گران بەسەریانەوە...

ئەگەر تەمەنی حەفتا هەشتا ساڵەی مرۆڤ بە تەمەنی زەوی بەراورد بکەین، ئەوا بێگومان تەمەنی مرۆڤ زۆر کورت دێتە بەرچاو، بگرە هەر هچیش نییە لەچاو تەمەنی زەویدا، وا نییە؟

تەمەنی زەوی ملیۆنان ساڵە، بەڵام تەمەنی مرۆڤ یەك لەسەر هەزاری ئەویش نابێت، جگە لە کورتییەکەی فانی و لەبنهاتووشە.

تەمەن هێندە بەخێرایی تێدەپەڕێت و، خۆری ژیان هێندە زوو ئاوا دەبێت، کە تەنانەت پێشی ناگەینەوە...

## با هەمووومان تەماشایەکی ژیانی خۆمان بکەینەوە:

دوێنێ کۆرپە و مەلۆتکەیەك بووین، پاش قۆناغی منداڵیمان بووینە هەرزەکار و، وردە وردە گەورە بووین تا بەم حاڵەی ئێستامان گەیشتین.

گەر تەمەنیشمان زیاتر درێژەی کێشا، ئەوا ڕۆژێك دێت کە منداڵانێك بە"مامە، یا خاڵە، یا پورێ" بانگمان بکەن.

دەڵێن لە حەزرەتی نوحیان پرسی (سەلامی خوای لێ بێت)، کە نزیکەی هەزار ساڵ ژیابوو: "دونیا و ژینت چۆن بینییەوە؟"

ئەویش وتی: "وەك خانوویەکی دوو دەرگا دێتە پێش چاوم، کە لەدەرگایەکیانەوە هاتوومەتە ژوورەوە و لەوی دیکەیانەوە دەچمە دەرێ".

ئەگەر ئەمە وتەی حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) بوو بێت، ئەوا ئێمە بڵێین چی!

* * *



تەمەن هەتا بڵێیت کورتە، تا بڵێیت زووتێپەڕ و فانییە، کەچی زۆرکات بە بەتاڵی ڕۆژەکانی بەڕێ دەکەین و، بە باشیی گرنگیی پێنادەین.

ناتوانین بیخەینە بارێکی سوودبەخش و بەرهەمدارەوە.. زۆرجار پلانمان بۆ ژیان نییە، بەڵام جاری وا هەیە گەر پلانیشمان هەبێت، ئەوا کات بەشمان ناکات.. بۆیە بەردەوام ناڕازین و سکاڵا لە حاڵی خۆمان دەکەین.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەمانەوێت ئەم کەلێنەمان پڕ بکەینەوە و، بەدوای ڕێگەچارەیەکدا دەگەڕێین و، پرس و ڕا بە کەسە ژیر و داناکانمان دەکەین و، دەمانەوێت سوود لە ئەزموونی پێشینان و باوباپیرانمان وەربگرین...

کورتترین ڕێگا و باشترین چارەسەر بریتییە لەوەی:

یەك: تەمەنمان لەڕێگەی ئەو زاتەدا بەسەر بەرین کە لە بنەڕەتەوە (تەمەن)ی پێ بەخشیوین.

دوو: بە ئاڕاستەی ویست و فەرمانەکانی ئەو زاتە هەنگاو بنێین.

سێ: لە بازنەی ڕەزامەندیی ئەودا بژین.

لەڕاستیدا ئەگەر سەرنج بدەین هەر سێ خاڵەکە یەك واتایان هەیە و، هەرسێکیان هەڵگری یەك مەبەستن.

– چۆن شتی وا دەبێت؟

– وەڵامی ئەم پرسیارە ئاسانە. بەم چەشنە:

ڕاستە تەمەن کورتە، بەڵام پێویست بە خەمخواردن ناکات، چونکە دەتوانن تەمەنتان درێژ بکەن و، خەمتان نەمێنێت.

– باشە چۆن و بەچی تەمەنمان درێژ بکەین؟

– من لێت دەپرسم: خوای گەورە باقی واتە هەمیشەییە؟

– بەڵێ هەمیشەییە.

– کەواتە ئێمەش دەتوانین تەمەنمان بێ کۆتا بکەین.

– چۆن؟ بەچی؟

– ئەگەر بە پێی ویست و ئارەزوو و ڕەزامەندی ئەو بژین، ئەوا ئیتر پێویست ناکات خەمی تەمەن درێژبوونمان بێت.

– باشە دەشێت لەم تەمەنە کورت و سنووردارەدا شتی وا ڕوویدات؟

– بەڵێ دەگونجێت شتی وا ڕوو بدات، بگرە ئەگەری نزیکەی لەسەدا سەدی هەیە...

بەسەربردنی یەك چركە لە پێناو خۆشەویستی و ڕەزامەندی خودادا، واتە یەك ساڵ ژیان، بگرە چەندین ساڵ، تەنانەت لەوەش زیاترە، بێ كۆتایی و نەبڕاوەیە...

ئەگەر یەك چركە یان یەك خولەك بەڕاستی لەپێناو خودادا بەسەر ببەین ئەوا ژیانێكی نەبڕاوە دەبەینەوە و تەمەنێكی بێ كۆتا بۆخۆمان مسۆگەر دەكەین.

بەڵام ئەگەر لە پێناو خودادا ژیانمان بەسەر نەبەین، ئەگەر چەندین ساڵیش بژین، ئەوا بەها و نرخی یەك چركەیان نییە.

لەم ڕوانگەیەوە، ئەگەر تەمەنمان لەپێناو خودادا بگوزەرێت ئەوا كورت نییە، بەڵكو باقی و نەبڕاوەیە، پووچ و بەتاڵ و بێ نرخ نییە، بەڵكو بەهادار و بەرهەمدارە.



ئەگەر تەمەنی خۆمان لە ئاوێنەی بێ كۆتایی خودادا ببینین، ئەوكات تەمەنمان باقی و نەبڕاوە دەبێت وەك ئەو تیشكەی كە دەشكێتەوە سەر ئەو ئاوێنەیەی بە دەستمانەوەیە.

***

ئـەو ڕێگایانـە لـە ژمـارە نایـەن کـە تەمـەنمان سـوودبەخش و بەرهەمدار دەکەن، بۆیە ئێمە گەر تەنانەت یەك ڕێگەشـیان بگرینەبـەر ئەوا بەسە بۆمان.

ئێمەی موسوڵمان ڕۆژانە پێنج نوێژی فەرز دەکەین.. کەواتە ئـەو کاتەی لەنێوان وادەی ئەنجامدانی دوو نوێـژدا بەسـەری دەبـەین، وەك ئەوە وایە بە نوێژکردنەوە بەسەرمان بردبێت.

ئەگەر یەك مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بین، وەك ئەوە وایە کە گشت ساڵەکەمان بە ڕۆژووگرتن تێپەڕاندبێت.

ئەگەر دەوڵەمەند بـین، بـەڵام زەکـاتی مـاڵ و سـامانمان بـدەین، وەك ئەوە وایـە کـە گشـت سـەروەت و سـامانەکەمان لـەپێناو خـوادادا بەخشیبێت.

ئەگەر هـەمووکات دەرفـەت و مـەجالی قورئانخوێنـدنمان نـەبێت، ئەوا -بە پشتیوانی خوا- بە خوێندنی سێ جار (سـورەتی ئـیخلاص) خێری خەتمێکی تەواومان بۆ دەنووسرێت.

گەر لەبەر خوای گەورە بووینە دۆستی کەسێك و دڵیمـان ڕاگـرت، ئـەوا وەك ئـەوە وایـە کـە دڵـی هـەموو خـەڵکیمان لـە خۆمـان ڕازی کردبێـت. دەتـوانین لـەم بارەیـەوە نموونـەی زیـاتر و زیـاتریش بهێنینەوە..

کەواتە بەم جۆرە دەتوانین لە تەمەنی کورت و، ڕۆژە کەمەکانی ژیانماندا سوود و بەرهەمێکی لەبن نەهاتوو چنگ بخەین.

ڕوونتر بڵێم: دەتوانین بەژیانی کورت و فانیی دونیامان، ژیانی هەتاهەتایی دوارۆژ و بەهەشت بەدەست بێنین، هەروەها دەتوانین بە ڕۆژە سنووردارەکانی ژیانمان ببینە خاوەن ڕۆژە بێکۆتاکانی بەهەشت.

وتەیەکی کورت و پوختیش هەیە، کە زۆر جوان ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە دەڵێت:

"لەبەر خوا کار بکەن.. لەبەر خوا یادی یەکتر بکەن.. لەبەر خوا هەوڵ بدەن.. لە بازنەی لەبەر خوا و بۆ خوا و بە مەبەستی ڕەزامەندی خوا (لله، لوجه الله، لأجل الله)دا کار بکەن، چونکە تەنها ئەوکاتە خولەکەکانی تەمەنتان ئەرزش و بەهای ساڵانێکی دوورودرێژی دەبێت".[1]

---

١– لە (بریسکەی سێیەم)ەوە وەرگیراوە.



# چۆن سەربەرزیی دوارۆژ بەدەستدەهێنرێت؟ چۆن خەمی دوارۆژمان نەمێنێت؟

"ئەم دونیایە (دارالحكمة) و (دار العمل)ە، نەك (دار الآخرة) و (دار الجزاء)، واتە پاداشت و كرێی كار و ڕەنجمان لە بەرزەخ و دوارۆژدا پێ دەدرێتەوە.

كار و كردەوەی دونیا لە بەرزەخ و دوارۆژدا بەر دەدات.. واتە ئەم دونیایە شوێنی خزمەتكردن و كاركردنە، نەك شوێنی پاداشت وەرگرتنەوە، پاداشتی پەرستش و كارەكانی ئەم دونیایەمان لە بەرزەخ و دوارۆژدایە و، درەختی بەندایەتی كردنی ئێرەمان لە جیهانی بەرزەخ و دوارۆژدا بەردەگرێت" .

لێرە كار دەكەین، لەوێ كرێكەمان وەردەگرین.

لێرە چاكە كۆدەكەینەوە، لەوێ خەرجی دەكەین.

لێرە ماندوو دەبین، لەوێ پشوو دەدەین.

لێرە دەبەخشین، لەوێ وەردەگرین.

لێرە لێدەنێین، لەوێ دەیخۆین.

لێرە تام دەکەین، لەوێ تێر دەخۆین.

لێرە دەمرین، لەوێ زیندوو دەبینەوە.

لێرە کاتیین، لەوێ نەمر و بەردەوامین.

ئێرە شتی کەمی لێیە، لەوێ هەموو شتێکی لێیە.

ئەگەر ئاوا وەك شیعر هەر ڕیزی بکەین و باسی بکەین، ئەوا هەرگیز ئەم شیعرە کۆتایی نایەت، بەکورتی: ئەم دونیایە بە جیهانی دواڕۆژ بەراورد ناکرێت و، بەیەك ناپێورێن، چونکە ئێرە هەرگیز بەوێ ناگاتەوە.

هەرگیز ترووسکەی ڕووناکیی مۆمێك و ڕووناکیی خۆر دەبن بەیەك؟! لەیەك ئاستدان؟!

وەڵامەکە ئاشکرایە!

* * *

ئەوە ڕوویەکی بابەتەکەیە، لەڕاستیدا ڕووەکەی دیکەی گرنگترە.

– ئەو ڕووەی تریان چییە؟

– ئەوەیە کە: ئێمە بۆ خزمەتکردن و کارکردن و ئەرك بەجێهێنان هاتووینەتە ئەم دونیایە.

ڕەنگە (هاتووین) گوزارشتێکی ڕاست نەبێت، بۆیە باشترە بڵێین (نێردراوین)، چونکە نە هاتن بەدەست خۆمانە و نە ڕۆیشتن بەدەست خۆمانە.

ئێمە نەماندەزانی کەی دێین و، ناشزانین کەی دەڕۆین.

ئەو زاتەی ئێمەی ناردووەتە ئێرە، ڕۆژێك بانگمان دەکاتەوە بۆلای خۆی و، لێرە نامانهێڵێتەوە؛ چونکە ئێمە لێرە میوانین، هاتووین ماوەیەك لێرە بین، ئیتر هەر کە کاتی میوانداری تەواو بوو دەبێت ئێمەش بڕۆین.

ئەو خودایەی ئێمەی ناردووەتە ئەم جیهانە، ئەرکەکانی ماوەی ژیانمانی بەڕوونی و ئاشکرایی بۆ دیاری کردووین، دیارە ئەمەش لە ڕێگەی پێغەمبەرە نازدارەکەیەوە ﷺ.

* * *

– ئێمە لێرە ئەرکمان چییە؟ پێویستە چ کارێك بکەین؟ چۆن خزمەتێك پێشەکەش بکەین؟

– تەنها یەك ئەرکی سەرەکیمان هەیە ئەویش: بەندایەتی، یا پەرستشە.

هەر بۆیە پەروەردگارمان فەرمانی بە چی کردبێت ئەوە ئەنجام دەدەین و، هەر شتێکیشی لێ قەدەغە کردبێتین لێی دوور

دەکەوینەوە.. هەر ئەرکێکمان پێ سپێردرابێت بە خۆشەویستی و عیشقەوە بەجێی دەهێنین و چێژ لە بەجێهێنانی دەبینین.

– بۆچی؟

– چونکە پەروەردگار ئەم جیهانە و خۆمان و هەموو ئەو شتانەش کە خۆمان بە خاوەنیان دەزانین و هەموو نیعمەتەکانی پێ بەخشیوین و، هەر خۆشی خاوەن دەستەڵاتی ڕاستەقینە و تاهەتاییە.



ئێمەش لەبەر ئەوەی زۆرمان خۆش دەوێت، هەموو فەرمانەکانی بێ سێ و دوو جێبەجێ دەکەین.

– باشە لەبەرامبەر ئەم خزمەت و ئەرکبەجێهێنان و پەرستشانەدا چی وەردەگرین؟ ئەی لەکوێ وەریدەگرین؟

– لە ڕاستیدا پرسیار و بابەتی سەرەکی و، بابەتێك کە پێویست بێت بزانرێت ئەمەیە...

سەرەتا گەر دەتانەوێت با تەماشایەکی ژیانی دونیا بکەین:

گەر مانگێکی تەواو لە کارگەیەك کار بکەین، ئەوا لە کۆتایی ئەو مانگەدا کرێکەمان وەردەگرین.



گەر تەواوی هاوین لە کێڵگە و باخەکاندا کاربکەین، ئەوا هەندێك جار بەرهەمەکەی لە زستاندا وەردەگرینەوە و، هەندێك جاریش پاش ساڵێك..

ئەوەتا ساڵێکی ڕەبەق وانە دەخوێنین، تا ئەنجامەکەی لە کۆتایی ساڵ و لەگەڵ وەرگرتنەوەی نمرەکاندا ببینینەوە.

کەواتە لەدنیادا: بەرهەم و ئەنجامی کارەکان بریتییە لە پاداشت و کرێی هەوڵ و ڕەنجدانەکان و کاتی تەواوبوونی ئەرکەکان بەدەستیان دەهێنین.

کارە ماددی و دنیاییەکان بەم جۆرەن، بەڵام ئەو کارانەش کە تایبەتن بە دواڕۆژەوە هەر بەم شێوەیەن.

لەم دنیایەدا فەرمانەکانی خودا بەجێ دەهێنین و، ئەرکەکانی سەرشانمان ڕادەپەڕێنین تا پاداشتەکەی لەو دنیادا وەربگرینەوە؛

چونکە کۆتایی ژیانی دونیاشمان دەستپێکی ژیانی دوارۆژ و ژینێکی نەبڕاوەیە.

بابەتەکە لایەنێکی دیکەشی هەیە، ئەویش:

وای دابنێ کارێکت کرد و پاداشتەکەیت وەرگرت، هەر بەو پارەیە بازرگانییەکی نوێت بۆخۆت سازدا و، قازانجێکی باشیشت لێکرد.

لە هەر جێیەك کار بکەین، کرێیەکەی لە بەڕێوەبەر یا خاوەنکار یا سەروەستاکە وەردەگرین؛ چونکە کرێ و پاداشتی کاری ماددیی هەر ماددەیە.

– باشە کێ دەتوانێت کرێ و پاداشتی بوونەوەر لەسەر پەرستش و شتە مەعنەوییەکان بداتەوە؟ ئەی چۆن چۆنی پاداشتیان دەداتەوە؟

– گەر نوێژمان کرد، ڕۆژوومان گرت، قورئانمان خوێند، یا بابەتێکی ئایینیمان بۆ هاوڕێیەکمان ڕوون کردەوە... ئایا مرۆڤێك هەیە بتوانێت پاداشتی ئەم پەرستشانەمان بداتەوە؟ کەسی وامان لەم دنیایەدا دەست دەکەوێت؟

بمانەوێ و نەمانەوێ کەسی وا نادۆزینەوە؛ چونکە تەنها هەر ئەو زاتە لە بەرامبەریاندا پاداشتمان دەداتەوە کە فەرمانی پێ داوین ئەرك و کار و پەرستش بکەین.

واتە پەروەردگار ئەركی پێ سپاردووین، هەر ئەویش لەبەرامبەردا پاداشتمان دەداتەوە.

پەروەردگار فەرمانی پەرستنی بەسەردا داوین، هەر ئەویش بەخششمان دەداتێ لەئاست بەندایەتی كردنماندا.

خۆ ئەگەر پاداشتی پەرستشەكان لەدنیا بدرایەتەوە، ئەوا نە دنیا بەشی دەكرد و، نە نیعمەتەكانی دنیاش...

* * *

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لە فەرموودەیەكی شیرینیدا دەفەرمووێت: "دوو ركات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی، لە دونیا و لەوەشی كە تێیدایە باشتر و چاكترە".

ئەگەر تەنها پاداشتی دوو ركات نوێژی سوننەت لەدنیا و ئەوەی كە تیایدایە باشتر بێت، ئەی باشە چۆن لەدنیادا پاداشتی ئەو هەموو نوێژە دەدرێتەوە كە ساڵەهایە ئەنجامیان دەدەین و، ئەو هەموو ڕۆژووەی كە ساڵەهایە دەیانگرین؟ بێگومان هەموو ئەم دنیایە بەشی ئەم پاداشتە زۆرە ناكات.

كەواتە، ئەو دونیا (دواڕۆژ)، ئەو جێیەیە كە گەنجینەی نیعمەتە بێ كۆتاكانی پەروەردگارمانی لێیە، پاداشتی ئەنجامدانی هەموو ئەو پەرستشانەش هەر لەوێ دەدرێتەوە.

جگه لەوەش ئەگەر لەدنیادا پاداشتمان وەربگرتایەوە، ئەوا مرۆڤ نەیدەتوانی زۆر سوود لەو نیعمەتانە وەربگرێت، چونکە ئێمە لـەدنیادا تەمەنێکی دیاریکراومان هەیە، بۆیە تەنها بۆ ماوەیـەك لـەو نیعمەتانـە سوودمەند دەبین.

لەبەرامبـەردا ئـەودنیا و دوارۆژ نـەبڕاوە و هەتاهەتاییـە، کەواتـە مادام لەو دونیادا بۆ هەتاهەتایە دەژین، کەواتە پاداشتیشـمان لەسـەر پەرستشەکان بە نەبڕاوەیی دەدرێتەوە.[1]

[1] لە (مەکتووبی بیست و نۆیەم)ەوە وەرگیراوە.

# ئەركی ئێمەی مرۆڤ چییە؟



"پێویستە مرۆڤ ئەرك و كاری خۆی بە باشی بەجێ بهێنێت و، خۆی لەكاری خوای گەورە و كردگارەوە هەڵ نەقورتێنێت".

لە كتێبی (أدب الدنيا والدين)[1]دا هاتووە، كە: ڕۆژێك شەیتان خۆی پیشانی حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) دا.. شەیتان دەست دەكات بە قسەی پووچ و بێ بنەما، لاشی وایە كە ئێستا حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) فریوی قسەكانی ئەم ئەخوات و گوێڕایەڵی دەبێت، بگرە كۆڵێكیش مەمنوونی دەبێت...

---

١- بڕوانە: كتێبی (أدب الدين والدنيا)ی ئەبولحەسەنی ماوەردی، لێكۆڵینەوەی: موستەفا سەقا، لا٢٧، چاپی دووەم.

کاتێـك حــەزرەتی عیســا (ســەلامی خــوای لــێ بێــت) وەڵامــی پرسیارەکانی دەدایەوە، ئەو ڕەخنەی دەگرت و، بەرپەرچی وتـەکانی دەدایەوە و، پێداگری لەسەر قسەکانی خۆی دەکرد.

یەکێك لە پرسیارەکانی شەیتان ئەوەبوو کە وتی: "وەك دەزانیت هەموو شتێك بەدەستی خودایە، تەنها خودا خۆی دەزانێـت کـێ کـەی دەمرێت و چۆن دەمرێت، ئەمە تەنها بە ویسـتی ئـەو دەبێـت. کەواتـە فەرموو برۆ لەسەر لووتکەی ئەم چیایەوە خـۆت فـڕێ بـدە خـوارەوە، چونکە ئەگەر لە چارەنووستدا ساغ و سەلامەتیت بۆ نووسرابێت، ئەوا هیچت لێ نایەت، جا با بزانین دەمریت یان نا"!

مەبەستی شەیتان ئەوە بوو کە حەزرەتی عیسا (سـەلامی خـوای لێ بێت) تووشی دڵەڕاوکێ بکات و سەری لێ تێك بدات.

بەڵام ئەو پێغەمبەر بوو، چـۆن دەگونجێـت پێغەمبـەرێك نێچـیری تەڵە تەقیوەکانی شەیتان بێت!

حەزرەتی عیسا (سـەلامی خـوای لێ بێـت) بـەم جـۆرە وەڵامـی ناماقوڵییەکانی شەیتانی دایـەوە: "هـەی نـەفام! خـوای گـەورە بـۆی هەیە بەندەی خۆی تاقیبکاتەوە، بەڵام بەندە بـۆی نییـە خـوای خـۆی تاقیبکاتەوە"!

واتە خوای گەورە بۆی هەیە بەنـدەی خـۆی تاقیبکاتـەوە و پێـی بفـەرمووێت: "ئەگـەر فڵانـە کـار ئـەنجام بـدەیت، ئـەوا پاداشـتت

دەدەمـەوە، ئـەوەتا لـە تواناشـتدا هەیـە بیکـەیت"، بەمـەش ئـەو بەندەیەی خۆی تاقی دەکاتەوە، بـەڵام بەنـدە مـافی ئـەوەی نییـە و، تەنانەت هەر لە تواناشیدا نییە پـەروەردگاری خـۆی تـاقی بکاتـەوە و بڵێت: "خوایە وا من فڵانە کارم ئەنجام دا، ئایا تـۆش فڵانـە کـارم بـۆ دەکەیت؟".. چونکە ئەگەر وا بکات، ئەوا سنووری خۆی بەزاندووە.

بەم شێوەیە بەم وەڵامەی حـەزرەتی عیسـا (سـەلامی خـوای لـێ بێـت)، شـەیتان دەمـی بەسـترا و ئـیتر جـارێکی دیکـە شـتی وای لـێ نەبیسترایەوە.

* * *

لەبەر ئەوە ئێمەش وەك بەندەیـەك تـەنها ئـەرکی خۆمـان بـەجێ دەهێنین و سـەرقاڵی کـاری خۆمـان دەبـین و، خۆمـان لـە کارەکـانی خوداوە هەڵ ناقورتێنین.

- دەکرێت زیاتر ئەمە ڕوون بکەیتەوە؟

- بۆ نموونە:

لەگەڵ هاوەڵێکی نوێژنەکەرماندا قسـە دەکـەین و، پێـی دەڵـێین: کەوا پێویستە نوێژ بکات، چـونکە بـە نوێـژکردنی دەبێتـە بەندەیـەکی خۆشەویسـتی خـودا، هـەروەها نوێـژ فـەرمانی خودایـە و، پێویسـتە ئەمیش فەرمانەکانی خوای گەورە بەجێ بهێنێـت.

ئـيتر ناوبـەناو لێـی دەپرسـینەوە بـزانین دەسـتی کـردووە بـە نوێژکردن، یاخود نا، کەچی دەبینین ئەو بەهیچ جۆرێـك تـوخنی نوێـژ ناکەوێت.

ئێمەش لەبەرامبـەر ئەمـەدا بێتاقـەت و بێـزار دەبـین و بـەخۆمان دەڵێین:

"ئەو هەمووەم لەگەڵدا وت، کەچـی سـوودی نـەبوو، کەواتـە مـن نەمتوانی کاری تێ بکەم... لەمەودوا ئیتر قسە بۆ هیچ کەس ناکەم"..

چونکە لەو ڕاستییە باش تێ نەگەیشتووین کە ئەرکی ئێمە باسـکردنی باسـەکە و، تێگەیانـدنی بەرامبەرکـەمان و ڕێنماییکردنیـەتی، ئیـدی کاریگـەربوونی ئـەو و قبـوڵ کردنـی ڕێنماییـەکانمان لەلایـەن ئـەوەوە کاری خوای گەورەیە.

- بۆچی؟

- چونکە ئەنجام پەیوەستە بە خوداوە و، ئاکامی هەموو کارێـك لای زاتی موبارەکیەتی.

گوێڕایەڵ بوونی برادەرەکـەمان و قبـوڵ کردنـی بـۆ بیروڕاکانمـان ئەنجامـە و، قبـوڵ نەکردنیشـی هـەر ئەنجامـە. لەڕاسـتیدا هـەردوو ئەنجامەکە پەیوەندییان بە خوداوە هەیە و، ئەنجام کاری ئێمـە نییـە، پێویست ناکات کۆڵی پێوە هەڵ گرین و خۆمانی لێ هەڵقورتێنین.

* * *

چیرۆکێکی بەناوبانگ لەم بارەیەوە هەیە کە دەڵێت:

جەلالەددین خوارزم شا، پادشایەکی زۆر چاونەترس بوو و، زۆر جار لە دژی لەشکرە بێ بەزەییەکەی مەغۆل کە بەسەرکردایەتی جەنگیز خان بوو شەڕی کردووە و، بەسەریاندا زاڵ بووە.. لە جەنگەکانیدا هەمیشە دەکەوتە پێش سوپاکەیەوە، بۆیە زۆرجار وەزیران و نزیکانی پێیان دەوت: سوڵتان ئەمجارەش بەسەرکەوتوویی دەگەڕێینەوە و، دوژمن تێکدەشکێنین، چونکە خوای گەورە تۆ بەسەر دوژمنانتدا سەر دەخات!

بەڵام ئەم پێی دەوتن:

"ئەوەی ئەرکی سەرشانی منە تێکۆشانە لەپێناوی خوای گەورەدا بۆ ئەوەی فەرمانی خواوەند بەجێ بهێنم و شوێنی بکەوم، ئیتر من کارم بە شتێکەوە نییە کە ئیشی خوای گەورە خۆیەتی و، نەخراوەتە ئەستۆی منەوە، چونکە چ سەرکەوتن و چ شکستهێنان هەردووکیان کاری تەقدیری خوای گەورەن.

جا لەبەر ئەوەی ئەم پاڵەوانە بەم نییەتەوە دەجوڵایەوە لە زۆربەی جەنگەکانیدا سەرکەوتنی بۆ خۆی و سوپاکەی مسۆگەر دەکرد.

* * *

هەروەك لە چیرۆكەكەشدا هاتووە، ئەركی ئێمە تەنها تێگەیاندن و ڕوونكردنەوەی ڕاستییەكانی باوەڕە بۆ ئەوانەی لە باوەڕ دوورن، واتە بە پێی توانا وتەی چاك و باش بە گوێی خەڵكیدا بدەین و، بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنماییان بكەین و، بەردەوام بین لەسەر كاری خۆمان.

لە ئەنجامیشدا هەندێك جار سەركەوتوو دەبین و هەندێك جاریش بە دەستبەتاڵیەوە دەگەڕێینەوە، بەڵام پێویستە لەهەردوو بارەكەدا بە ئەنجامەكە ڕازیبین و سكاڵا لە بەختی خۆمان نەكەین.

خۆ پێغەمبەری ئازیزیشمان ﷺ هەر وای كردووە.. ئەو تەنها بانگەوازی باوەڕ و ئیسلامی بە خەڵكی گەیاندووە، ئیتر هەندێكیان بەگوێیان كردووە و بڕوایان پێهێناوە، هەندێكی دیكەشیان بەرەنگاری بوونەتەوە و بڕوایان پێنەهێناوە.

بەڵام پێغەمبەر ﷺ هەرگیز وازی لە بانگەوازكردن نەهێناوە و، كۆڵی نەداوە، بەڵكو گوێنەگرتنی ئەوان پێغەمبەری ﷺ زیاتر هانداوە، تا زیاتر تێبكۆشێت.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: (پێغەمبەر تەنها ئەوەی لەسەرە کە پەیامەکە بگەیەنێ و فەرمانی خوداتان بۆ ڕوون بکاتەوە، لەوەبەدوا خۆتان بەرپرسن) المائدة: ٩٩.[١]

(بێگومان تۆ ناتوانی هیدایەتی هەر کەسێ بدەی کە حەزت لێ بێ هیدایەت وەرگرێ. ئەمە کاری خوای خۆیەتی و ئەو هیدایەتی هەر کەسێ ئەدا کە مەیلی لێ بێ هیدایەتی بدا و، ئەو خۆی باشتر ئەزانێ کێ ئامادەیە بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرێ) القصص: ٥٦.

پێغەمبەرمان ﷺ ئەمەی دەزانی، هەر بۆیە خۆی لەکاری خوداوە هەڵ نەدەقورتاند، کە هیدایەت دانی مرۆڤەکانە بۆ سەر ڕێی باوەڕ و خواپەرستی. هەروەها تەنها کاری خۆی ئەنجام دەدا و سەرقاڵی ئەرکەکانی خۆی بوو.[٢]

---

١- تەفسیری ئایەتەکانی نێو ئەم پەرتووکە لە خولاصەی تەفسیری نامیییەوە وەرگیراوە.

٢- لە (بریسکەی حەقدەیەم)ەوە وەرگیراوە.



## بەهەشت ئاسان دەست دەکەوێت؟

"ئـەم ڕۆژگـارە دەریخسـت کـە بەهەشـت گرانـە و بـە هـەرزان دەستناکەوێت.. هەروەها دۆزەخیش لە خۆڕا نییە و زیاد لە پێویسـت نییـە. ئەگـەر بەهەشـت نەبوایـە ئـەوا دۆزەخ جێـی سـزای کـەس نەدەبوو".

لێرەدا دوو ڕاستی و، دوو بنچینە و، دوو بڕیار هەیە:

یەکـەمیان، ئەوەیـە کـە: (بەهەشـت هـەرزان نییـە) و، ئـەوەی دیکەشیان ئەوەیە کە: (ئەگـەر بەهەشت نەبوایـە دۆزەخـیش بەسوێ نەدەبوو).

هاوتـا لەگـەڵ ئـەم دوو ڕاستییەشـدا، ڕاسـتییەکی دیکـە بـەدی دەکرێت، ئەویش ئەوەیە کە: (دۆزەخ هەرلـەخۆوە دروسـت نـەکراوە و لەڕیزی پێویستییەکاندایە).

– ئەمانە یەعنی چی؟ ئێمە چی لەم دەستەواژانەوە فێر دەبین؟

– سەرەتا، بەهەشت بەهیچ جۆرێك وا سادە و ساكار دەست مرۆڤ ناكەوێت، بەڵكو مسۆگەركردنی جێیەك تێیدا هەرگیز ئاسان نییە.

– كەواتە دەبێت ئێستە چی بكەین؟

– پێویستە بۆ گەیشتن بە بەهەشت كاتەكانمان بەفیڕۆ نەدەین و، بێ وچان و، بێ پشودان، لەسەر ڕەنج و كۆشش بەردەوام بین.

هیچ كەس بە وەستان و، كەیف و سەفا كردن و، خۆش ڕابواردن و، سەرقاڵبوون بە كاری هیچوپووچەوە بەهەشت نابینێت.

خوا ئاگادارە ئەم كارانە هیچ كەس تا بەردەرگای بەهەشتیش ناگەیەنن.

– كەواتە پێویستە بۆ چوونە بەهەشتەوە چی بكەم؟

– خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەجوانی وەڵامی ئەم پرسیارەی بۆ ڕوون كردووینەتەوە:

(بەڕاستی خاوەن باوەڕەكان ڕزگاریان بووە*ئەو خاوەن باوەڕانەی كە لە نوێژەكانیانا لەخواترس و ئارامن* كە لە گوتار و كرداری بێسوودیش خۆیان لائەدەن* كە زەكاتی ماڵی خۆیشیان دەرئەكەن* كە عەورەتی بەرودوای خۆیشیان ئەپارێزن* تەنها بۆ هاوسەری شەرعیی خۆیان یان كەنیزەكیان نەبێ كە بەگوێرەی شەرع بووبن بە هیی ئەوان، بەڕاستی ئەوانە لۆمەیان ناكرێ ئەگەر بچنە لای

ئـەو جۆرەکەسـانە. دەی کەسـانیٚ بـەدوای لـەو دوو ڕێگـا شـەرعییەی پێوەندی نێوان پیـاو و ئـافرەت بـەولاوە بکـەون، ئەوانـە یـەجگار زۆر دەسدرێژییان کـردووە* هـەروەها ئـەو موسـوڵمانانە ڕزگـار بـوون کـە ئەگەر ئەمانەتێکیان لا دانرابیٚ و گفت و پـەیمانێکیان دابـیٚ ئاگـاداریی بکـەن و دەسپیسـی لـە ئەمانەتەکـەدا نەکـەن و گفـت و پەیمانەکـە نەشکێنن* ئەوانـەیش کـە پارێزگـاریی نوێـژەکانیان ئەکـەن و نـاهێڵن نوێژیان بچیٚ* ئەوانەن ئەو کەسانەن کە بەهەشت بە میرات ئەبەن بـۆ خۆیـان* ئەوانـەی بەهەشـت بـە مـیرات وەرئـەگرن هەمیشـە تیایـا ئەمێننەوە و نامرن) المؤمنون: ١-١١.

* * *



لـــە هـــەمان کاتـــدا: چاوەکانمان، دەممـان، زمانمـان، دەسـتمان، قاچـمان، سـەرمان، گوێیـــەکانمان لـــە شـــەیتانی نـەفرینلێکراو بـەدوور بگـرین و، شـــوێن ویســـت و ئـــارەزووە خراپەکانی نەفسمان نەکەوین.

لـە ڕاسـتیدا ڕەنگـە بتـوانین نرخی بەهەشت لەم وتەیەدا کۆ بکەینەوە:

"ئەوە بکەین کە خوا ویستی لەسەرە، واتە خوا لە خۆمان ڕازی بکەین و هەر شتێك کە خوا پێی ناخۆشە لێی دووربکەوینەوە و ئەنجامی نەدەین. هەروەها شوێنکەوتەی ڕێباز و پەیامەکەی پێغەمبەرمان بین ﷺ و، ژیانمان ئاوێتەی شێوازی ژیانی ئەو بکەین".

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە نرخ و بەهای بەهەشت گرانە و هەروا بە ئاسانی و بە هەڕەمەکی بەدەست نایەت..

هەر ئەوەندەمان لەدەست دێت لە خوای گەورە بپاڕێینەوە: بەهەشت بە ئاسانیی بکاتە نسیبمان.

## گەر بەهەشت هەبێت، دۆزەخیش هەیە:

- بەهەشت هەیە؟
- بەڵێ هەیە..
- دە کەواتە دۆزەخیش هەیە.

نە بێ بەهەشت دۆزەخ دەبێت و، نە بێ دۆزەخیش بەهەشت دەبێت؛ چونکە دۆزەخ بێ هۆ و لەخۆوە بەدینەهێنراوە.

بۆ نموونە:

زیندانەکان لە خۆڕا دروست نەکراون.. چونکە ئەگەر تاوان هەبێت، ئەوا سزاشی هەیە، بۆ بەجێگەیاندنی سزاش دەبێت خانەیەکی سزا هەبێت.

بۆ ئەوەی تاوانبار، بە خۆیدا بچێتەوە و لێپرسینەوەی دەروونی خۆی بکات، ئەوا پێویستە لە زیندانێکدا بە تەنها زیندان بکرێت.

تەنها بەم شێوەیە دادپەروەری بەرپا دەبێت، چونکە گەر کەسی ستەمکار یاخود تاوانبار سزای خۆی وەرنەگرێت، ئەوا ئەم دونیایە ژیانی تێدا نامێنێت. بەڵام ناشکرێت لە دنیادا بە هەموو سزای خۆی بگەیەنرێت.

بۆ نموونە: کەسێك کە بڕوا بەخودا ناهێنێت و، پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەری پێ قبوڵ نییە و، بوونی دوارۆژ و فریشتەکان ڕەت دەکاتەوە... ئەم مرۆڤە لەم دنیایەدا چۆن سزایەك بدرێت؟

ئەم کەسە بێ باوەڕە، بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانەکانی نەناسیوە و، بوونی خاوەنێکی بۆ گەردوون و بوونەوەران ڕەت کردووەتەوە.

کەواتە ئەم کەسە، لە ئاست مافەکانی پەروەردگار بەسەر بەدیهێنراوەکانیدا زیادەڕۆیی کردووە و سەرپێچیکار بووە.



یاخود کەسێك کەسێکی کوشتووە و، لەدنیاشدا بە سزای خۆی نەگەیەنراوە، لەم بارەدا چۆن دەتوانیت مافی کوژراوەکە لە بکوژەکە بسەنیتەوە؟

پێویستە بۆ سزادانی ئەمانە و کەسانی وەك ئەمانە کە تاوانی دی ئەنجام دەدەن، جێیەکی دیاریکراو هەبێت.

گەر وا نەبێت، واتە هەموو کەسێك هەرچییەکی کرد، بیدات بەدەم ئاوەوە و هەرگیز نەیبینێتەوە، ئەمە چۆن ژیانێك دەبێت، شتی وا لە دادگەریی خودادا بوونی نییە.

کەسێکی درندە و ستەمکار بهێنە پێشچاوت.. چەند کەسی کوشتووە؟ یەك نییە و دووان نییە، لەوانەیە سەدان و هەزاران کەسی

کوشتبێت، تەنانەت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کەسی وا هەیە کە بووەتە هۆکاری کوشتنی ملیۆنان کەس!

لە دنیادا هیچ سزایەك هەیە پڕبەپڕی ئەو هەموو تاوانەی ئەو کەسە بێت؟! خۆ ئەگەر سزاش بدرێت، باشە چەند ساڵ لە زینداندا بەندی بکەن؟ ملیۆنێك؟ ئایا تەمەنی کورتی بۆ سزای ئەم هەموو تاوانە بەش دەکات؟

لەبەر ئەمە پێویستە لەپێناو بەرپاکردنی دادپەروەری و، پاراستنی مافی ستەمدیدە و، هەروەها سزادانی تاوانباران، بەهەشت و دۆزەخیش هەردووکیان هەبن.

بەهەشت و دۆزەخ دوو ئەستێرکی گەورەی پەروەردگارن، بەهەشت بە باوەڕداران و، دۆزەخیش بە بێ بڕوایان پڕ دەکات..

بڕواداران، لەبەر ئەوەی بە گوێرەی ویست و خواست و ئیرادەی خوای گەورە ژیاون، ئەوا بەرەو باخەکانی بەهەشت بەڕێدەکەون و، بێباوەڕانیش لەبەر خوانەناسییان و بەرەنگاربوونەوەی یاساکانی ئەو زاتە لە دۆزەخدا نوقم دەبن، واتە هەردوو ئەستێرکەکە ئاکامی هەڵبژاردەی مرۆڤن.

– چۆن؟

- ئەو کەسەی بە ئیمانەوە دەژی دەچێتە بەهەشتەوە، ئەو کەسەش ژیانی لە کوفر و گومڕاییدا بەسەر دەبات دۆزەخ پاشەڕۆژیەتی.

کەوابوو، بەهەشت هەیە و، دۆزەخیش هەیە...

پاداشتیش هەیە و، سزاش هەیە...

کەیف و خۆشی و خۆشگوزەرانی هەیە و، دەرد و مەینەتیش هەیە...

لە کۆتاییدا جێ و لانە بۆ بڕواداران هەیە و، بۆ بێ بڕوایانیش هەیە...[1]

---

١- لە (مەکتووبات: ناوکەکانی حەقیقەت)ەوە وەرگیراوە.

# بۆچی حەزرەتی ئادەم (سەلامی خوای لیٚ بیٚت) لە بەهەشتەوە نیٚردرایە سەر زەوی؟



حەزرەتی ئادەم (سەلامی خوای لیٚ بیٚت) یەکەمین مرۆڤە و، یەکەم پیٚغەمبەرە و، پەروەردگار ئەوی لە نەبوونەوە هیٚنایە بوون.

خوای گەورەش لەبەر ئەوەی حەزرەتی ئادەمی بە یەکەم مرۆڤ و بیٚ دایك و باوك بەدیهیٚنا، دایکە حەوامانی بە دووەمین مرۆڤ بەدیهیٚنا.

هەردووکیان بەخۆشی لە بەهەشتدا دەژیان.

(ئیبلیس)یش لە بەهەشتدا بوو، ئیبلیس، هەر ئەو شەیتانەیە کە هەموو ڕۆژیٚك پەنا بەخوا دەگرین لە شەڕ و فڕوفیٚڵەکانی.

خوای گەورە شەیتانی لە ئاگر و، ئادەمیشی لە خاك و خۆڵەوە بەدیهیٚنا.

خـوای پـەروەردگار فـەرمانی بـە شـەیتان کـرد کـە کوڕنـووش (سوجدە) بۆ ئادەم بەرێت و لە نەفسی خۆی بە بالاتری بزانێت.

بەڵام شەیتان بەمە ڕازی نـەبوو، هـەروەك لـە قورئانـدا هـاتووە: (ئیبلیس وتی: بۆیە سوجدەم بۆ نـەبرد چـونکە مـن لـەو چـاکترم. تـۆ منت لە ئاگر دروست کردووە و ئەوت لە قوڕ دروست کردووە) ص:٧٦..

خـوای گـەورە لەسـەر سەرپێچـی کـردن و گوێڕایـەڵ نـەبوونی شەیتان بۆ فەرمانەکەی، لە بەهەشت وەدەرینا.

هەر بۆیە شـەیتان لەسـەر ئـەم ڕووداوە بـووە دوژمنـی ئـادەم و، کەینوبەینێکی ڕێکخست بۆ ئەوەی ئادەمیش لە بەهەشـت بـەدەرکردن بدات.

خوای گەورە خواردنی میوەی جۆرە درەختێکی لە ئادەم و حەوا قەدەغە کردبوو.

شەیتانیش بۆ ئەوەی ئەوان لـەم قەدەغـەکراوە نزیـك بکاتـەوە و لایان شیرین بکات، لە هەوڵ و تەقەللادا بوو.



لەدەرەوەی بەهەشتەوە وەسوەسەی لە دڵی ئادەم و حەوادا نایەوە، هەروەك لە قورئاندا باسکراوە: (چـووە بـن کلێشـەیان وتی: خودا بۆیە خواردنی بەری ئەو دارەی

لێ مەنع کردوون تا نەبنە مەلائیکە، یا تا لە بەهەشتدا بە ئەبەدی نەمێننەوە، واتە: ئەگەر بێت و لێی بخۆن یا ئەبنە مەلائیکەت یا هەتا هەتایە لە بەهەشتدا ئەمێننەوە) الأعراف:١٢. ئەوانیش بە قسەی شەیتانیان کرد و لە بەری دارەکەیان خوارد.

لەبەر ئەوە خوای گەورە هەردووکیانی لە بەهەشت وەدەرنا و، ناردنییە دنیا.

کاتێك ئەم دوو مرۆڤە هاتنە سەر زەوی دەستیانکرد بە ڕازاندنەوە و نەخشاندنی تا وەك بەهەشتی لێ بکەن...

* * *

لە ڕاستیدا ڕەوانەکردنی باوکە ئادەم و دایکە حەوا لە بەهەشتەوە بۆ سەر زەوی ئاکامی ویست و تەقدیری خودا بوو، نەك سزایەك بۆ ئەوان و، وەسوەسەکەی شەیتان و، خواردنی بەری درەختەکە بە قسەی شەیتان تەنها هۆکارێك بوو.. خوای گەورە هەر لە بنەڕەتەوە ویستی لەسەر ئەوەبوو کە ئەم دوانە بکاتە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی و، هەر خۆشی ئەم هۆکارانەی ڕێکخستبوو.

کەواتە ناردنی باوکە ئادەم و دایکە حەوا بۆ سەر زەوی سزا نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە فەرماندارکردن و ئەرکپێدانێك بوو بۆیان.

ڕوونتر بڵێم، ئەرکی ئەوان لەبەهەشتدا تەواو بووبوو و، بۆ وەرگرتنی ئەرکێکی نوێ نێردرانە سەر زەوی.

ئەگەر پێغەمبەر ئادەم لە بەهەشتدا بمایەتەوە ئەوا پلەوپایەی وەك فریشتەیەك جێگیر دەبوو و، بەهرە و تواناکانی گەشەیان نەدەکرد و، نەك تەنها خۆی و دایکە حەوا، بەڵکو نەوەکانی مرۆڤایەتیش هەر وا دەبوون.

– ئەمە یەعنی چی؟

– فریشتەکان، بوونەوەرانێکن کە هەردەم یەك کار دەکەن و یەك ئەرك بەجێدەهێنن و، هەموو ئەرك و کارەکانیان دیاریکراون.

بۆ نموونە: ئەو فریشتەیەی کە بەرپرسە لە ژیانی درەختێك، بەردەوام هەر ئەو کارەی هەیە.

ئەو فریشتەیەش کە بەرپرسە لە پەڵەهەورێك، هەردەم سەرقاڵی ئەو پەڵە هەورەیە.

ئەو فریشتەیەی بەرپرسە لە مرۆڤێك، خۆی بە کەسانی دیکەوە سەرقاڵ ناکات.

فریشتەکان بەردەوام لە پەرستشدان، هەندێکیان بەردەوام لە ڕوکوعدان و، هەندێکیان بەردەوام لە کڕنووش (سوجدە)دان و، هەندێکی دیکەشیان بەردەوام گوێ بۆ قورئان ڕادەگرن.

لەپاڵ ئەمانەدا هەندێك لە فریشتەکان بەرپرسن لە تۆمارکردنی چاکەکانمان، هەندێکیان گوناهەکانمان تۆمار دەکەن، هەندێکی دیکەشیان لە مەترسی و کارەساتەکان دەمانپارێزن.

واتە هەر فریشتەیەك بۆ چ كارێك بەدیهێنرابێت، تەنها ئەو كارە ئەنجام دەدات و لەو كارە بەولاوە هیچ كارێكی دیكە ناكات.

كاری فریشتەكان نەگۆڕە، پلەوپایەشیان جێگیرە، ئەم بنەمایانەش بەهیچ جۆرێك ناگۆڕێت و هەروەك خۆی دەمێنێتەوە.

– مرۆڤیش هەروایە؟

– بەدڵنیایەوە نەخێر، مرۆڤ هێندە توانا و لێهاتوویی هەیە كە لە ژماردن و باسكردن نایەن.

خوای گەورە بەهرەگەلێكی یەك لەیەك سەرسوڕهێنتر و باشتری بە مرۆڤ بەخشیوە. لەبەر ئەوە مرۆڤ لە هەموو بابەتێكدا پشت بە ژیریی و ئەقڵی دەبەستێت و، خۆی دەناسێت و، زانیاری نوێ بەدەست دەهێنێت، بەم جۆرە هەمیشە خۆی نوێ دەكاتەوە و بەرەوپێش دەچێت.

لە ڕووی هەست و نەستیشەوە مرۆڤ خاوەنی هەزاران چەشن لە هەستی ئاراستەكارە بەرەو گەشەبەخۆدان. ئەم هەستانەش پێویستە لە بواری مەعنەویدا بدرەوشێنەوە و ڕۆشنكەرەوە بن.

بەم شێوەیە مرۆڤ هەم لە ڕووی زانست و عەقڵەوە و، هەم لە ڕووی هەستەكانەوە بوونەوەرێكە كە گەشەسەندن و بەرەوپێشچوونی بەردەوامە.

شوێنی پەرەپێدانی ئەم هەستانەش بەهەشت نییە؛ چونکە لەوێ هەموو شتێك بە کۆتا خاڵ و قۆناغی تەواو (کامڵ) گەیشتووە و، لە بەرزترین ئاست و لووتکەدایە.

لە بەهەشتدا هەموو شتێك بێ کەموکورتین و ڕێکوپێکن، هیچ پێویستیان بە نوێکاری و چاکسازی نییە.

فریشتەکان لە هەمان خاڵدان و هەمان ئەرك بەجێدەهێنن، لەبەر ئەمە پلەوپایەیان هەروەك خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام خۆ مرۆڤایەتی پێویستی بە پێشکەوتن و، چاکسازی و، بەرزبوونەوەی مەعنەوی و، سەرکەوتنی پلەپلە و نزیکبوونەوەیە لە خوای گەورە، شوێن و مەیدانی ئەم کارانەش دونیایە.

خوای گەورە پێش ناردنی باوە ئادەممان بۆ سەر زەوی، گشت زانست و زانیارییە پێویستەکانی پێ بەخشیوە و فێری کردووە.

گرنگترین زانستیش خواناسییە، هەر وەك خوای گەورە لە قورئاندا ئاماژەی پێ دەکات: (جا لەبەر ئەوە کە خودای گەورە ئادەمی هەڵبژاردبوو بۆ جێنشینیی خۆی، ناوی هەموو شتە پێویستییەکانی فێرکرد و تێی گەیاند..) البقرة: ٣١.

بەدرێژایی مێژوو هەر لە حەزرەتی ئادەمەوە تا پێغەمبەری ئازیزمان (سەلامی خوایان لێ بێت) ئەم پەیامەیان بە گەلەکەیان گەیاندووە:

خودا بەدیهێنەرە، خودا ڕۆزیدەرە، خودا بەسۆز و میهرەبانە، خودا نیعمەتبەخشە...



خودا زانایە بە هەموو شتێك، خودا هەموو شتێك دەبیستێت، خودا هەموو شتێك دەبینێت.

واتە مرۆڤیش بە تێگەیشتنی لە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە، لەڕووی ئیمانییەوە بەرزتربوویەوە و، درەوشایەوە و، بەرەو پێش چوو و...

گەر گوێڕایەڵی شەیتان نەبێت و، شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووە خراپەکانی نەفسی نەبێت و، ئالودەی ئارەزووەکانی نەبێت و، ڕێگە خراپەکان نەگرێتەبەر و، خۆی لە تاوان بەدووربگرێت و، خۆی لە حەرامکراوەکان لادات، ئەوا جوانییەکانی ناخی خۆی دەدۆزێتەوە.

هەر بەم جۆرە هاوەڵان (صەحابی)یەکان و، ئەولیاکان و، گەورە زانا و بلیمەتەکان پێگەیشتوون و خوێندکارەکانی ئەوانیش و، ئەوانەی شوێنپێی ئەوانیان هەڵگرت، بەپێی توانا و بەهرەی خۆیان، بۆ پایە و پلە بڵندەکان بەرز بوونەوە.

لەم ناوەندەدا کەسانێکیش هەن کە توانا و لێهاتووییەکانیان لەڕێگەی خراپدا بەکارهێناوە، چونکە ملکەچی شەیتان بوون و، شوێن

نەفس و خۆشییە زووتێپەڕ و قەدەغەکراوەکان کەوتوون و، لە ژینگەیەکی پڕ تاوانکاریدا ژیاون، لە ئاکامدا لە تاقیکردنەوەکانی ژیاندا دەرنەچوون و شکستیان هێناوە.

ئەمانە ستەمیان لەخۆیان کردووە و، هەم دنیای خۆیان کاول کردووە و، هەم بەهەشتیشیان لەدەست دەرچووە و، کەوتوونە حاڵێکەوە کە شیاوی چوونە دۆزەخ بن.[1]

---

١- لە (مەکتووبی دوازدەیەم)ەوە وەرگیراوە.



## ئایا حەزرەتی خضر (سەلامی خوای لێ بێت) لەژیاندا ماوە؟

پێغەمبەرێکمان هەیە پێی وتراوە (خضر).

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویێت: (شتی وامان فێرکردبوو لە ڕێگای وەحی بۆ کردنی ئێمەوە نەبێ نازانرێ) الكهف:٦٥.

جۆرە زانستێك هەیە پێی دەڵێن (مِن لَدُن عِلْم)، کە خوای گەورە بە چەند بەندەیەکی تایبەتی خۆی دەبەخشێت و، زانستێك نییە کە بە وانە خوێندن فێری ببیت.. حەزرەتی خضریش (سەلامی خوای لێ بێت) یەکێکە لەو بەندانەی خوای گەورە ئەم جۆرە زانستەی فێرکردووە و، هیشتا لە ژیاندا ماوە.

– چۆن لە ژیاندا ماوە؟! ئەی کەس هەیە ئەو ببینێت؟

– حەزرەتی خضر حاڵی حازر لە ژیاندایە، بەڵام کە دەڵێم ژیان، بەم ژیانەی خۆمان تێ مەگەن.

لەم جیهانەدا چەندین جۆری دیکەی ژیان جگە لەوەی ئێمە هەیە.



ئێمە زۆرینەی ئەو ژیانانە نازانین، چونکە نەماندیون و تیایاندا نەژیاوین، بەڵام بڕوامان بە بوونیان هەیە.

حەزرەتی خضر -وەك حەزرەتی ئیلیاس- (سەلامی خوای لێ بێت) ژینێکی سەربەست و تایبەت بەخۆی هەیە، کە بە هەل و مەرجەکانی شوێن و کاتەوە پابەند نەکراوە.

لەیەك کاتدا دەتوانێت لە چەند شوێنێکی جیاجیادا ئامادە بێت، واتە دەتوانێت لەیەك کاتدا لەسەر زەوی، لە ئاسمان، لە جێگەی دیکەشدا بێت.

بۆ نموونە ئێمە کاتێك کە خەیاڵ دەمانباتەوە، دەتوانین بە خەیاڵ لە چەند شوێنێك بین، خەوبینینیشمان نموونەیەکی دیکەی ئەم شێوازەیە.

حەزرەتی خضر هەروەك ئێمە مرۆڤە، بەڵام وەك ئێمە هەموو پێویستییەکی ناوێت، چونکە ژیانی ئەو پشت بە پێداویستییە مرۆییەکان نابەستێت.

بۆ نموونە، هەرکات ویستی دەخوات و دەخواتەوە، بەلاّم وەك ئێمە گیرۆدە نییە پێیانەوە و، دەشتوانێت بێ خواردن و خواردنەوە بژی.

زۆر چیرۆك و موعجیزە و بەسەرهات دەربارەی حەزرەتی خضر هەیە، پێدەچێت ئێوەش هەندێکتان بیستبێت.

دەگێڕنەوە پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی:

ڕۆژێك حەزرەتی مووسا (سەلامی خوای لێ بێت) قسەی بۆ نەوەکانی ئیسرائیل دەکرد. لێیان پرسی: "کێ زاناترینی مرۆڤەکانە؟"، ئەویش فەرمووی: "من زاناترین کەسم".

بەلاّم خوای گەورە بە حەزرەتی مووسای فەرموو: "لەو شوێنەی کە دوو دەریاکە بەیەك دەگەن، یەکێ لە بەندەکانمی لێیە ئەو لە تۆ زاناترە".

مووساش فەرمووی: "پەروەردگارم چۆن دەتوانم بەو بگەم؟".

پەروەردگار فەرمووی: "لە هەرکوێ ماسییەکەت لێ ون بوو، ئەو بەندەیەمان لەوێیە".

مووسا (سەلامی خوای لێ بێت) ملی ڕێی گرتەبەر و، (یووشەع)ی خزمەتکاریشی لەگەڵ خۆی برد.

خوای گەورە لە ئایەتی (٦٠-٨٢)ی سورەتی (الکهف)دا زۆر بەجوانی ئەم بەسەرهاتەی باسکردووە، کاتێك دەفەرموێت:

(باسی ئەوە بکە کە ڕۆژێ مووسای کوڕی عیمران، پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل، بە یووشەعی خزمەتکار و خوشکەزای خۆی وت: هەر ئەڕۆم و ناوەستم تا ئەگەمە ئەو شوێنەی دوو دەریاکە ئەگەنە یەك، یا ماوەیێکی زۆر ئەڕۆم.

کە گەیشتنە شوێنی بەیەکگەیشتنی دوو دەریاکە، ماسییەکەیان کە لە تۆشەبەرەیەکا بوو و ئامادە کرابوو بۆ خواردن لەبیر چوو. ماسییەکەیش بە فەرمانی خودای گەورە زیندوو بوویەوە و ڕێگەی خۆی لە دەریادا گرتەبەر و ڕۆیی.

کە ئەو شوێنەیان بەجێ هێشت مووسا بە یووشەعی وت: ئا خواردەمەنیەکەی نیوەڕۆمان بۆ بێنە، بەڕاستی لەم سەفەرەماندا زۆر ماندوو بووین.

یووشەع وتی: ئاگات لێ نەبوو کە چووینە پاڵ تاشە بەردەکە بۆ حەسانەوە و تۆ خەوت لێ کەوت؟ لەوکاتەدا من ماسییەکەم لەبیرچوو و شەیتان نەبێ کەس لەبیری نەبردمەوە و، ماسییەکە بە شێوەیەکی سەیر ڕێگای خۆی لە دەریادا گرتەبەر و ڕۆیی.

مووسا وتی: دەرچوونی ئەو ماسییە لەناو تۆشەبەرەکە بۆ ناو دەریا ئەوەبوو کە ئێمە ئەمانویست، چونکە ئەوە نیشانەی جێگای گەیشتنە بەو بەندەیە کە خوا بە منی فەرموو. جا هەردووکیان دوابەدوا گەڕانەوە و شوێن پێی خۆیانیان هەڵئەگرتەوە.

جا کە گەڕانـەوە بـۆ شـوێنی دەرچـوونی ماسـییەکە گەیشـتن بـە بەندەیێ لە بەندەکانی ئێمە کە ڕەحمەتی پێغەمبەرایەتیمان پێ دابوو و شتی وەهامان فێرکردبوو لە ڕێگای وەحی بـۆ کردنـی ئێمـەوە نـەبێ نازانرێ.

مووسـا پێـی وت: ئایـا ڕێگـام ئـەدەی دوات کـەوم و لەگـەڵتا بم بەمەرجێ لەوەی فێـر کـراوی لـە هۆیـەکانی ڕوشـد و مەعریفـەت فێـرم بکەی؟

ئەویش وەڵامی مووسای دایـەوە و وتـی: تـۆ نـاتوانی لەگـەڵ مـن بسازێی و خۆت لەگەڵ من پێ ناگیرێ.

تۆ چۆن خۆت ئەگری لەسەر کارێ کە هەر دیوی دەری ئـەبینی و نازانی دیوی ناوەوەی چییە؟

مووسا وتی: ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ ئـەمبینی خـۆگر ئـەبم و لـە هیچ شتێکدا بێ گوێیت ناکەم.

وتی: باشە، ئەگەر دوام کەوتی و لەگەڵم هاتی هەرچی ئەکەم لێم مەپرسە تا خۆم پێت ئەڵێم.

جا پێکەوە ڕۆیشتن تا گەیشتنە کەشتییەك و سواری بوون. هەر کە سوار بوون کابرا تەشوێیەکی هـەڵگرت و کەشـتییەکەی کـون کـرد. مووسا پێی وت ئەوە کەشتییەکەت شکاند تا خەڵکەکەی ناوی نوقـوم بکەیت؟ بە ڕاستی کارێکی خراپی گەورەت کرد!

پیاوەکە بە مووسای وت: پێم نەوتی تۆ لەگەڵم هەڵناکەی و خۆت پێ ڕاناگیرێ؟

مووسا وتی: لێم مەگرە کە ئامۆژگارییەکەتم لەبیرچوو و بارم بە توانج و توورە بوون گران مەکە.

دوای ئەوەی لە کەشتییەکە دەرچوون کەوتنەوە ڕێ تا گەیشتن بە منداڵێکی نابالغ و هاوڕێکەی مووسا کوشتی. مووسا وتی: ئەوە نەفسێکی بێ گوناهت کوشت بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ؟! بەڕاستی کارێکی زۆر ناشیرین و ناڕەوات کرد!.

هاوڕێکەی مووسا وتی: ئاخر پێم نەوتی تۆ ناتوانی لەگەڵ من خۆت ڕاگری؟

مووسا وتی: ئەگەر پاش ئەم ڕووداوە دەربارەی هەر شتێ پرسیارم لێ کردی هاوڕێیەتیم مەکە. ئەم چەند جارە پرسیارم لێ نەکردی عوزرم هەبوو.



جا کەوتنەوە ڕێ تا گەیشتە دێیەك. لەوکاتەدا برسییان بوو، داوای خواردەمەنییان لە خەڵکی دێیەکە کرد، ئەوانیش میواندارییان نەکردن. لەو دێیەدا دیواری خانوویێکیان دی خەریك بوو بڕووخێ. هاوڕێیەکەی مووسا ڕاستی

کـردەوە. مووسـا پێـی وت: ئەگـەر بتویسـتایە کرێیـەکت لەسـەر چاککردنەوەی ئـەم دیـوارە وەرئـەگرت و دەفعـی ئـەم برسـییەتییەی خۆمانمان پێ ئەکرد!

هاوڕێکەی مووسا ناوی (خضر) بوو، بە مووسای وت: ئێستا ئیتر کـاتی لێـك جیابوونـەوەی مـن و تۆیـە و، لەمـەولا تـۆ لەگـەڵ مـن هەڵناکـەیت. وا ڕاسـتی حەقیقـەتی هـۆی ئـەو کارانـەت پـێ ئـەڵێم کـە خۆتت پێ ڕانەئەگیرا و ڕەخنەت لێ ئەگرتم لەسەریان.

هەرچی کەشتییەکەیە کە کونم کرد، ئەوە موڵکی چەند کەسێکی هەژار بـوو لـە دەریـادا کاریـان ئـەکرد و بـە دەرامـەتی ئـەو کەشـتییە ئەژیان. پادشایێك لەدوایانەوە بوو هـەر کەشـتییەکی سـاغ و سـەلیمی بدیایە داگیری ئەکرد، منیش عەیبـدارم کـرد تـا ئـەو پادشـایە داگـیری نەکات.

هەرچی کوڕەکەیش بـوو کـە کوشـتم، بـاوك و دایکـی موسـوڵمان بوون. ترسـاین کـە گـەورە بـوو، بـە لـەخواياخیبوون و کـافریی خـۆی ناڕەحەت و ماندوویان بکا.

ویستمان خودا کوڕێکی لەو باشتریان بداتێ نەفسـی پـاکتر بـێ و میهرەبانتر بێ لەگەڵیان و قازانجی ببێ بۆیان.

دیوارەکەیش کە ڕاستم کـردەوە هیـی دوو منـاڵی هـەتیو بـوو لـە شارەکەدا و، لەژێر ئـەو دیـوارەدا غەزنـەیێکی زێـڕ و زیویـان هـەبوو و

باوکیشیان پیاوێکی چاك بوو. خودای تۆ ویستی ئەو منالآنە گەورە بین و فام پەیدابکەن و ئەو غەزنەیان دەربێنن و سوودی لیّ وەرگرن. جا ئەگەر دیوارەکە بڕووخایە خەلّکی بە غەزنەکەیان ئەزانی و ئەیانبرد بۆ خۆیان. ئەمەیش میهرەبانییەك بوو لە خوداوە دەربارەی ئەو منالآنە. ئیتر من لە خۆمەوە ئەو کارانەم نەکردووە و بە فەرمانی خودا کردوومن. ئەمە ڕاستیی ئەو کارانە بوو تۆ خۆتت پیّ ڕانەگیرا و، ڕەخنەت لەسەر کردنیان لیّ گرتم) ..[1]

---

١- لە (مەکتووبی یەکەم)ەوە وەرگیراوە.

# ئەو نەهەنگەی کە حەزرەتی یوونسی

## (سەلامی خوای لێ بێت) قوت دا!



بەسەرهاتی حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) بەناوبانگە و، پوختەکەی بەم جۆرەیە: پەروەردگار حەزرەتی (یوونس)ی وەك پێغەمبەرێك بۆ خەڵکی شاری (نەینەوا) ڕەوانەکردووە.

(نەینەوا) دەکەوێتە شوێنێك لە نزیك شاری (موسڵ).

لەوکاتەدا دانیشتووانی نەینەوا نزیکەی سەدهەزار کەس دەبوون، هەمووشیان بتپەرست بوون و، شەرمیان دەکرد لە خراپە بگەڕێنەوە.

حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێبێت) باسی ئاینی ڕاستەقینەی بۆ دەکردن و، بانگێشتی دەکردن بۆ خواپەرستی و، هەوڵی دەدا لە خراپەکارییش دووریان بخاتەوە، بەلام خەڵکەکە هیچ

نەدەچوو بە گوێیاندا و هەر لەسەر کارە نابەجێکانی خۆیان بەردەوام بوون و، چاویان لە ئاست قسەی هەقدا هەڵ نەدەهات و، تا قورقوڕاگەیان نوقمی تاوان و سەرپێچی بووبوون.

هەر بۆیە ڕۆژی سزادانیان نزیکبووبووەوە و، خوای گەورە چل ڕۆژی وەك دەرفەتێك بۆ دیاری کردن دەنا بە زریانێکی گەورە سزایان دەدات. حەزرەتی یوونسیش (سەلامی خوای لێ بێت) لەم بڕیارەی خوای گەورە ئاگاداری کردنەوە، بەڵام خەڵکەکە بەهیچ شێوەیەك گوێیان بۆ ڕانەگرت.

لە ڕۆژی سی و حەوتەمدا ئیدی نیشانەکانی زریانەکە دەرکەوتن.. دنیا تاریك داهات و، کەشێکی سامناك ئەو ناوەی تەنی، بەڵام ئەوان هەروەك نە بایان دیبێت نە بۆران، دەستیان لە کەللەڕەقی و گومڕایی هەڵ نەگرت!



لە ئەنجامدا حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) لە گەلەکەی تووڕەبوو و سەری خۆی هەڵگرت، چووە کەنار دەریاکە و سوار کەشتییەك بوو. کەشتییەکە بەدەریادا کەوتە ڕێ، بەڵام لە پاش کەمێك کەوتە ئەملا و ئەولاکردن.

لــەنێوان سەرنیشــینەکاندا تیروپشــك کــرا بــۆ ئــەوەی کەســێك هەڵبژێرن تا فڕێی بدەنە ئاوی دەریاکەوە، تیروپشـکەکەیان ســێ جـار دووبارە کردەوە و لە هەرسێ جارەکـەدا حـەزرەتی یـوونس (سـەلامی خوای لێ بێت) دەردەچوو.

ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە تاوانبار بوو، چونکە سەرەڕای ئەوەی کـە پێغەمبەر بوو بەڵام سەبری نـەبووبوو و بـێ فـەرمانی خـودا گەلەکـەی جێهێشتبوو.

هەرچەندە تاریکەشەو بوو و، دەریاکە شـەپۆل بـەدوای شـەپۆلدا تەوژمی دەدا، بەڵام حەزرەتی یـوونس (سـەلامی خـوای لـێ بێـت) بـە قەدەری خوای گەورە ڕازی بوو و خۆی هەڵ دایە دەریاکەوە.

لەم کاتەدا خودا نەهەنگێکی فەرماندار کردبوو، هەر کە حەزرەتی یـوونس (سـەلامی خـوای لـێ بێـت) کەوتـــە دەریاکـــەوە، نەهەنگەکـــە دەمـــی کـــردەوە و، بـــێ ســـێ و دوو قووتی دا و حەپەلووشی کرد.



لەو کاتەدا حـەزرەتی یـوونس (سـەلامی خـوای لـێ بێـت) بـەدڵ نزایـەکی بـەکوڵی کـرد و بـەردەوام بوو لەم دوعایەی، تـا پـاش حـەوت

ڕۆژ خوای گەورە نزاکەی گیرا کرد و، فەرمانی بە نەهەنگەکە کرد لە کەنار دەریاکە دایبنێت. حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) زۆر ماندوو بووبوو و، پێستی لەشی بەتەواوی سوابوو، بۆیە خوای گەورە لەسایەی بڕکە کولەکەیەکی گەلاپاندا حەواندیەوە.

پاش ئەوەی حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) تەندروستیی بەرەو باشبوون چوو و توانی بەڕێدا بڕوات، زووبەزوو بەرەو نەینەوا کەوتە ڕێ.. هەرچەندە چاوەڕوانی دەکرد شارەکە سەرەوبن بووبێت و بووبێتە وێرانە و، خەڵکەکەی لەناوچوو بێت، کەچی کاتێك لە شارەکە نزیکبووەوە، شتێکی دیکەی بینی، تەماشای کرد وا شارەکە هەر لەجێی خۆیەتی و خەڵکەکەش ژیانی ئاسایی خۆیان دەگوزەرێنن، بەڵام جیاوازییەك لە سیمای خەڵکەکەدا بەدی دەکرا! بینی وا تەوبەیان کردووە و، چی دی بت ناپەرستن و، وازیان لە کارە بەد و ناشیرینەکانیان هێناوە، خوو و ڕەفتاریان بەو شێوەیەی لێهاتووە کە پێغەمبەرەکەیان بانگەوازی دەکردن بۆی.

- باشە ئەمە چۆن بووە؟

- کاتێك زریانەکە زۆر لە شارەکە نزیك بووەتەوە، دانیشتووانەکەی لە نێوان خۆیاندا کۆبوونەتەوە و ڕاوێژیان بە پیاوماقوڵ و ڕیشسپییەکانیان کردووە کە چی بکەن، بەڵام هەرچی سۆراغی پێغەمبەرەکەیان کردووە نەیاندۆزیوەتەوە.

لە ئەنجامدا هەموویان ئیمانیان بە خودا هێناوە و دەستیان کردووە بە خواپەرستی.. خوای گەورەش تەوبەکەی لێ وەرگرتوون و سزاکەی لەسەریان لاداوە.. بەم جۆرەش خەڵکەکە ڕزگاریان بووە.

دانیشتووانی شاری نەینەوا کە حەزرەتی یوونسیان بینی، دەورەیان لێ دا و، لەو ڕۆژە بەدواوە بوونە شوێنەکەوتەی بانگەوازەکەی.

* * *

ئەو ڕووداوانەی بەسەر حەزرەتی یوونسدا (سەلامی خوای لێ بێت) هاتوون، بەکورتی بەم شێوەیە لە قورئان و مێژووی پێغەمبەراندا باسکراوە:

حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) خرایە ناو دەریاوە، پاشان نەهەنگێکی گەورە قوتی دا و، شەوی تاریک و دەریای پەشێویش بوونە هۆی ئەوەی حەزرەتی یوونس ترس و بیمی لێ بنیشێت و، هەموو هۆیەکی هیوا و ئومێدی لێ ببڕێت. ئا لەم کاتەدا حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) بەهۆی پاڕاناوە نەرم و نزا بەکوڵ و بێ گەردەکەیەوە خوا ڕزگاری کرد، کاتێك وتی: ﴿لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين﴾ الأنبياء:٨٧، واتە: (خوایە لە تۆ بەولاوە خوایەکی تر نییە بەحەق بپەرسترێت، تۆ لە هەموو

کەموکورتی و ناتەواوییەك پاکی و، منیش یەکێ بووم لەوانەی ستەمیان لە خۆیان کردووە، دەی سا فریام کەوە).

حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) لە ناوەڕاستی دەریاکەدا و لە سکی نەهەنگەکەدا بوو و، هیچ هۆکارێکی ڕزگاریی شك نەدەبرد، چونکە ترووسکەی هەموو هۆکارەکانی ڕزگاری کوژابوونەوە.

لە ڕاستیدا دەبێت ڕزگارکەری لەو حاڵە، تەنها زاتێك بێت کە دەستەڵاتی بەسەر نەهەنگ و دەریاکە و شەوەزەنگەکەشدا هەبێت.

گەر سەرنج بدەین، دەبینین لە یەك کاتدا نەهەنگی سامناك و دەریای پڕشەپۆل و تاریکەشەوەکەش لەدژی ئەو بوون و هێرشیان بۆ هێنابوو، خۆئەگەر کەسێك فەرمانی بەسەر یەکێ لەم سیانەدا نەڕوات ناتوانێت ئەو ڕزگار بکات.. تەنانەت ئەگەر هەموو بوونەوەران لەو تەنگانەیەدا کۆبووبوونایەتەوە تا یارمەتییەکی بدەن، نەیاندەتوانی هیچ سوودێکی پێ بگەیەنن!

حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) پێغەمبەر بوو و، دەیزانی و دڵنیابوو کە جگە لە خودا هیچ هێزێك بە هانایەوە نایەت و، تێگەیشتبوو کە هەموو هۆکارەکان کپکراون و لەکار کەوتوون، بۆیە ڕووی دڵی لە خودا کرد.

* * *

پاش ئەوەی حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) ئەو دوعایەی خوێند، خودای دەریاکە و نەهەنگەکە و شەوەزەنگیش ئەم شتانەی کردە مایەی ڕزگاربوونی.

لە ئاکامدا نەهەنگێك بووە ژێردەریاییەك بۆی و، شەپۆلە ترسێنەرەکان هێور بوونەوە و کشومات بوون و، ئەو پەڵە هەورانەش کە ئاسمانیان تەنیبوو و دنیایان کردبوو بە تاریکستان، ڕەوینەوە و، ئاسمان بووە سایەقەی سامال و ڕووناکی مانگ ڕۆشناییەکی بە دەریاکە بەخشی. واتە هەموو ئەو بوونەوەرانەی کە تەنگیان پێ هەڵچنیبوو، ڕووی دۆستانەی خۆیان نیشان دا، لەپاشان گەیشتەوە کەنار دەریاکە و، لە ژێر سێبەری گەڵای کولەکەکەدا بەسۆز و میهرەبانیی پەروەردگاری شاد بووەوە.

ئیتر با لە ڕووداوەکانی چیرۆکەکەوە بچینەسەر پەند و ئامۆژگارییەکانی باسەکە:

ئەگەر تەماشای حاڵی خۆمان بکەین، دەبینین ئێمە لە بارودۆخێکی وادایـن کە چەندین جار لەوەی حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) سامناکترە.

– بۆچی؟

– چونکە ئەو شەوەزەنگەی باڵی بەسەر ئێمەدا کێشاوە داهاتوومانە، داهاتووشمان پڕیەتی لە مەترسی، ئەگەر بیر لە خودا

نەکەینەوە و، بێ ئاگا لە پەروەردگارمان بژین، ئەوا ژیانمان سەدجار لەو تاریکستانە ترسناکترە کە حەزرەتی یوونسی (سەلامی خوای لێ بێت) تێدا بوو.

دەریاکەشمان، ئەم زەویەمانە کە لەناو کەشکەشانی ئاسماندا دەسورێتەوە و، چەندین ڕووداوی دێنە پێش.

ئەم دەریایەی دنیامان، لەگەڵ هەر شەپۆلێکیدا هەزاران تەرم لەگەڵ خۆیدا دەبات و، هەموو ڕۆژێك هەزاران خەڵکی بەهۆیانەوە دەمرن و ڕوو لەو دنیا دەکەن.

نەهەنگەکەی ئێمە، ئەم نەفسە بەدکار و شەڕخوازەمانە، کە بەردەوام بەرەو گوناه و ئارەزووەکان پاڵمان دەنێت.

نەفسمان ژیانی هەتاهەتایمانی خستووەتە مەترسی و تەنگەبەرەوە و، دواڕۆژمانی لەسەر هەڵدێر و لێواری لەناوچوون داناوە و، هەوڵی لەناوبردنی دەدات.

لەبەر ئەمە نەهەنگەکەی ئێمە هەزاران جار لەو نەهەنگە مەترسیدارترە کە حەزرەتی یوونسی هەڵ لووشی (سەلامی خوای لێ بێت)؛ چونکە ئەو نەهەنگەی ئەوی قوتدا هەڕەشەی لەسەر ژیانی سەد ساڵی ئەم دنیای دروست کرد بوو، بەڵام نەفسی ئێمە هەڕەشەیە بۆسەر ژیانی هەتاهەتای نەبڕاوەمان.

* * *

ئیدی حاڵی ئێمە وایە، لەبەر ئەوە چارمان نییە و پێویستە شوێن پێی حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) هەڵبگرین و، هەموو هۆکارە دونیاییەکان وەلا بنێین و، بە دڵسۆزیی و ڕاست و ڕەوانی ڕوو لە پەروەردگارمان بکەین و، تەنها پشت بەو ببەستین و، نزای: "لا إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ" بخوێنین.

تا بزانین و ببینین کاتێ ئەم نزایە دەخوێنین و ڕوو لە خودا دەکەین و پشتی پێدەبەستین، چۆن لە هەموو مەترسییەك ڕزگارمان دەبێت.. هەروەها چۆن بێ هیچ زیانێك دەژین.

جارێ دەبێت بەر شەپۆلی ڕەحمەتی خودا بکەوین و، داوای یارمەتی هەر لە خودا بکەین، چونکە هەموو شتێك بە فەرمان و ویست و ئیرادەی زاتی موبارەکییەتی.. ئەو زاتەی دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت و، هەموو بەدیهێنراوان دەبات بەڕێوە و، هەموو شتێك لە سایەی دەستەڵات و دانایی ئەو زاتەوە ملکەچی ئێمەیە.

بە وتنی: "لا إلە إلا الله" داوا لە خوای تاك و تەنها دەکەین داهاتوومان بۆ ڕۆشن و ڕووناك بکاتەوە.

بە وتنی: "سبحانك" خۆمان لە دەستی مەترسییەکانی دنیا ڕزگار دەکەین.

بە وتنی: "إني كنت من الظالمين" تکا لە خوای گەورە دەکەین کە بە بەزەیی و میهرەبانییەوە لێمان بڕوانێت.

بەم شێوەیە بە نووری ئیمان و قورئان داهاتوومان لە تاریکستانی نەزانی و نەفامی ڕزگار دەکەین؛ چونکە خودا دوارۆژ و بەهەشت و ژیانی نەبڕاوەی لەبەر ئێمە بەدیهێناوە، ئەم دنیایەش کە ئێمەی لەسەر کۆڵی هەڵگرتووە و، وەك کەشتییەکی مەعنەوی دەمانگێڕێت و، لە شەپۆلە بێ بەزەییەکان دەمانپارێزێت و بە ساغ و سەلامەتی دەمانگەیەنێتە کەناراوەکانی ئاسوودەیی و دڵنیایی.

گەر بەپێی قورئان خۆمان پەروەردە بکەین، ئەوا نەفسمان زیانمان پێ ناگەیەنێت و، بەسەرماندا زاڵ نابێت، بەڵکو ئێمە بەسەریدا زاڵ دەبین.

نەفسمان ملکەچی فەرمانەکانی ئیرادە و عەقڵمان دەکەین و، دەیکەینە هۆکاری چوونە بەهەشتمان، بۆ ئەوەی چۆن حەزرەتی یوونس (سەلامی خوای لێ بێت) ڕزگاری بوو، ئێمەش هەر وا لە هەموو مەترسییەکان ڕزگارمان ببێت و، خوا یار بێت بە ئیمانەوە ژیانمان بگوزەرێنین..[1]

---

١– لە (بریسکەی یەکەم)ەوە وەرگیراوە.



## ئازارەکانی

## حەزرەتی ئەییوب

## (سەلامی خوای لیّ بیّت)

کاتێك ناوی (ئەییوب) دەبیستین، یەکسەر سەبر و ئارامگریی بەخەیاڵماندا دێت.

حەزرەتی ئەییوب (سەلامی خوای لیّ بیّت) هەرچییەکی بەسەردا هاتبێت بە خێری زانیوە و، لەسەر هەموو نەخۆشی و ئازار و مەینەتییەك ئارامی گرتووە. لە ڕاستیدا بەسەرهاتی ئارامگرتنی ئەو بووەتە داستانی نێو خەڵکی و، بە (پاڵەوانی ئارامگرتن) ناسراوە.

– بۆ.. ئەم پێغەمبەرە چی بەسەرهاتووە؟

– جا چی بەسەر نەهاتووە! ڕەنگە بەڵایەك نەمابێت بەسەری نەهاتبێت.

ئەم پێغەمبەرە (سەلامی خوای لیّ بیّت) کەسێکی زۆر دەوڵەمەند بوو، خاوەنی ڕەز و باخێکی بێشومار بوو، ڕانەمەڕ و بزنی زۆری هەبوو، پارە و پوولیشی یەکجار زۆر بوو، کوڕ و کچی هەبوو...

زۆریش سەخی و نانبدە و بەخشندە و دەستکراوە بووە، هەر هەژارێ یا نەدارێکی دیبێت خواردن و خواردنەوەی پێ داوە و، پێداویستییەکانی بۆ دابین کردووە، بۆیە هەردەم ماڵەکەی لە میوان جمەی هاتووە. سەرەڕای ئەم هەموو سەروەت و سامانەشی زۆر هۆگر و پابەندی پەرستش و خواپەرستی بوو، هەرگیز پەرستشەکانی دوانەدەخست و، بێ تەمبەڵی و کەمتەرخەمی ئەنجامی دەدان.

لەبەر ئەمەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا لەبارەیەوە دەفەرمووێت: (ئێمە دیمان ئەییوب لەو سەردەمی نەخۆشی و دەرد و ئازارەیا زۆر بە سەبر و تەحەممول بوو. ئەییوب بەندەی چاکە و هەمیشە بە تۆبە لە گوناە ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا) ص:٤٤.

ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار هەموو شتێکی لەدەست دا و، ماڵ و سامان و هیچی بۆ دەرنەچوو، هەموو



منداڵەکانیشی مردن، لە ماڵەوە تەنها خۆی و خێزانەکەی مانەوە و تەنیا کەوتن.

جگە لەوەش نەخۆشییەکی زۆر سەختی گرت، کە هەموو لەشی بوو بە برین و، نەیدەتوانی لەجێی خۆی ڕاستبێتەوە و بجوڵێت.

هەرچەندە نەخۆشییەکەی چەند ساڵێکی خایاند، بەڵام هەرگیز سکاڵای دەرنەبڕی و، لای کەس سکاڵای لە دەست حاڵی خۆی نەکرد و، لەسەر هەموو شتێك ئارامی گرت و، لەبەر ئەوەی پاداشتی ئارامگرتنی دەزانی، ئارامگرییەکی زۆر گەورەی نواند.

ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە (سەلامی خوای لێ بێت) لەسەر هەموو ئەم ئازار و ناڕەحەتیانەیەوە، هێشتاش هەر لەسەر پەرستشەکانی بەردەوام بوو و، هەرگیز لە یادی خودا غافڵ نەدەبوو.. بەڵام وای لێهات ماکی نەخۆشەکییەی گەیشتە زمان و دڵی، ئەمەش دەبووە ڕێگر لەبەردەم یادکردن و پەرستنی خوادا.

ئیتر ئەوکات لەبەر ترسی دواکەوتنی لە پەرستشەکانی، نەك لەبەر کەیف و لەشساغی خۆی، دەستی کرد بە نزا و پاڕانەوە لە خودا هەروەك لە قورئاندا هاتووە:

(یادی ئەییوبیش بکەرەوە لەو کاتەیا کە بانگی کردە خوای خۆی و هاواری لێ کرد وتی: خوایە من تووشی دەرد و بەڵا هاتووم و تۆیش لە هەموو میهرەبانێ میهرەبانتری) الأنبیاء:٨٣ .

ئەم نزا پاکە لەلای خوا گیرابوو و، خوداش وەحیی بۆ کرد و فەرمانی پێ دا: (ئێمەیش بەدەنگیەوە هاتین و چی ئێش و ئازاری پێوەبوو هەموومان لادا و بە ژمارەی منالە مردووەکانی منالمان دایە و ئەوەندەی تریش بە میهرەبانیی خۆمان بۆ ئەوەی ببێ بە پەند و ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی خوای خۆیان ئەپەرستن) الأنبياء:٨٤.

حەزرەتی ئەییوب (سەلامی خوای لێ بێت) قاچی بەزەویدا کێشا و، ئاوێکی شیرین و شیفابەخشی لە زەویەوە بۆ هەڵقولا، پاش ئەوەی بەم ئاوە خۆی شوشت، وەك ئەوەی ئاو بە ئاگردا بکەن، هیچ برینێك بە لاشەیەوە نەما و هەموویان سارێژ بوون.

بەم شێوەیە پەروەردگار ئەم پێغەمبەرە بەرێزەی تاقی کردەوە و، پاش ئەوەش تەمەنێکی دوورودرێژی پێ بەخشی.

* * *

چیرۆکی حەزرەتی ئەییوب (سەلامی خوای لێ بێت) بەکورتی بەم جۆرە بوو. ئێستا با بزانین ئێمە لەم بەسەرهاتەوە چی فێر دەبین:

سەبر و تەحەممولی ئێمە لەچاو سەبر و سوپاسگوزاریی حەزرەتی ئەییوبدا (سەلامی خوای لێ بێت) زۆر سادە و ساکار و کورت مەودایە!

- جا ئێمە چۆن دەتوانین خۆمان بخەینە جێی حەزرەتی ئەییوب (سەلامی خوای لێ بێت)؟ خۆ ئەوەی بەسەر ئەودا هات، بەسەر ئێمەشدا نایەت.

- لەڕاستیدا ئێمەش تاڕادەیەك وەك ئەو گرفتار دەبین.

- چۆن؟

- لە تەمەنی یازدە ساڵی بەولاوە، وردەوردە ئیتر قۆناغی گەنجێتی دەست پێ دەکات، پاشان دەگەینە تەمەنی باڵغ بوون و لێپرسراوی، واتە ئیتر پاداشت و سزا دێتە ئاراوە.

دەشێت شەیتان بە لاڕێماندا بەرێت.

دەشێت نەفسمان گێژەڵوکەی دەریایەك تاوانمان بکات.

دەشێت پێچەوانەی فەرمانی خودا بجولێینەوە.

ڕەنگە توخنی قەدەغەکراوەکان بکەوین.

بەم جۆرە دڵ و ڕۆحمان بریندار دەبن و، بە تاوانەکان گەردیان لێ دەنیشێت و پیس دەبن.

* * *

- واتە ئێمەش دەتوانین لەم ڕووەوە خۆمان بە حەزرەتی ئەییوب (سەلامی خوای لێ بێت) بەراورد بکەین؟

- بەڵێ، ئێمە لە بەرامبەر برینەکانی لاشەی ئەودا، لە ڕۆح و دڵ و ناخماندا برینداریین.

ئەو لاشەی نەخۆش بوو، ئێمەش ڕۆح و دڵمان نەخۆشە.

بە جۆرێکە ئەگەر بێت ناخمان ببێتە ڕوخسارمان و، ڕوخسارمان ببێتە ناخمان، واتە دیوی ناوەوەمان بۆ دەرەوە و دیوی دەرەوەشمان بۆ ناوەوە هەڵبگێڕینەوە، ئەوا زۆر لە حەزرەتی ئەییوب (سەلامی خوای لێ بێت) دەردەدارتر و نەخۆشتر دەردەکەوین.

– چۆن؟

– هەر تاوانێك کە ئەنجامی دەدەین، هەر گومانێك کە شەیتان لە مێشکمانی دەنێت، دڵ و ڕۆحمان بریندار دەکات.

برینەکانی حەزرەتی ئەییوب (سەلامی خوای لێ بێت) مەترسییان بۆ سەر ژیان کورتخایەنی دنیای دروست کردبوو، بەڵام برینە مەعنەوییەکانی ئێمە هەڕەشەیەکی سامناکە بۆ سەر ژیانی هەتاهەتامان و، مەترسین لەسەر هیوای چوونە بەهەشتمان، کەواتە ئێمە هەزاران جار زیاتر پێویستمان بەو نزایەیە کە حەزرەتی ئەییوب (سەلامی خوای لێ بێت) کردی.

ئەو کرمانەی لە برینەکانی حەزرەتی ئەییوبەوە (سەلامی خوای لێ بێت) پەیدا بووبوون، گەیشتبوونە دڵ و زمانی.

ئێمەش هەر واین و، ڕەنگە ئەو برینانەی کە لە تاوانەکانمانەوە پەیدا دەبن و، ئەو وەسوەسە و گومانانەی کە لە برینەکانمانەوە

سەرهەڵدێنن –خوا پەنابات– بگەنە دڵمان، کە لانەی ئیمانە و زیان بە ئیمانمان بگەیەنن.

ئێمە بە زمانمان دان بە ئیمانەکەماندا دەنێین، بەڵام کاتێک نوقمی تاوانەکان بووین، ئیدی تامی ناو دەممان دەگۆڕێت و، چێژ و لەززەتی ئیمانمان لەدەست دەچێت و، یاد و زیکر و ناوبردنی خودا بێزاری دەکات، تا وای لێدێت کە بەتەواوی لە ئاست یادکردنی خودادا کپ و بێ دەنگ دەبێت.

ئێمەش بۆ ئەوەی لەم مەترسییە ڕزگارمان بێت و، پێمان لە تەڵەکانی شەیتان نەکەوێت لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە، هەروەها بۆ ئەوەی خۆمان لە تاوان بەدوور بگرین، نزا دەکەین. تەنانەت ئەگەر لە زەلکاوی گوناه و تاوانیشدا بین دوعا دەکەین و لەخوا دەپاڕێینەوە بۆ ئەوەی خۆمان لەو تاوانانە پاك بکەینەوە.

وەك پێغەمبەر ئەییوب (سەلامی خوای لێ بێت) پەنا دەبەینەبەر قاپی کردگاری مەزن و، پشت بە میهرەبانیی ئەو دەبەستین.

هەروەك لە قورئاندا هاتووە بەم جۆرە نزا دەکەین: ﴿إِنّي مَسَّنيَ الضُرُّ و أَنْتَ أَرْحَمُ الراحمين﴾ الأنبياء: ٨٣، واتە: (خوایە، من تووشی دەرد و بەڵا هاتووم و، تۆیش لە هەموو میهرەبانێ میهرەبانتری).[١]

---

١– لە (بریسکەی دووەم)ەوە وەرگیراوە.

# پێویستە چۆن نەوەکانی پێغەمبەرمان ﷺ خۆش بوێت؟



بچووکترین و خۆشەویستترین و شیرینترین کچی

پێغەمبەری خوا ﷺ، فاتیمە بوو.

پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی خۆشدەویست، هەردەم

دەیفەرموو: "فاتیمە پارچەیەکە لە من".

هیچ باوکێك بە ئەندازەی پێغەمبەر ﷺ کچەکەی خۆی خۆش نەویستووە، چونکە ئەوین و خۆشەویستی ئەو شتێکی دیکە بوو.. هیچ کەسێکی دیکە نییە هێندە خۆشەویستی خۆی بۆ منداڵەکانی دەرببڕێت.

خـــاتوو فاتیمـــه و حـــەزرەتی (عـــەلی کـــوڕی ئـــەبو تالّیـــب) هاوسەرگیرییان کرد و، بوونە دایك و بـاوکی دوو کوڕی خوێنشـیرین، ئەوانیش (حەسەن و حوسێن)ن.



جـاری وا هـەبوو کاتێـك پێغەمبـەر ﷺ نوێژی دەکرد و لە سـوجدەدا دەبـوو، ئـەوان دەهاتنـــە ســـەر پشـــتی، پێغەمبـــەریش ﷺ لێیـــان دەگـــەڕا تـــا خۆیـــان لەســـەر پشـــتی دەهاتنە خوارێ.

هەنـدێك جـار پێغەمبـەر ﷺ حەسـەن یـا حوسـەینی لـە بـاوەش دەگرت و دەهات بۆ مزگەوت و، پێشنوێژی بۆ موسـوڵمانان دەکـرد و، کاتێك دەچووە سوجدە لەسەر زەویەکە لە تەنیشتی خـۆی دایـدەنا و کاتێکیش لە سوجدە هەڵ دەستایەوە لە باوەشی دەگرتەوە.

ڕۆژێـك پێغەمبـەر ﷺ حەســەنی لەســەر شــانێکی دانــابوو و حوسەینیشی لەسەر شانەکەی دیکەی، جا هەردەمە و یەکێکیانی ماچ دەکرد و دەیفەرموو: "هەر کەسێك ئەمانەی خۆش بوێـت مـنی خـۆش ویستووە و، هەر کەسیش ڕقی لێیانبێت ڕقی لە منە".

* * *

جارێك له پیاهەڵدانێكی ئەواندا فەرموویەتی:

"خودایە! من ئەم منداڵانەم خۆش دەوێت، هەر كەسیش ئەوانی خۆشویست تۆش خۆشتبوێت."[1]

دووبارە ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ حەسەنی لە كۆڵدا بوو و بەڕێدا دەڕۆیشت، هاوەڵێك كە ئەم دیمەنەی بینی وتی: "چ كۆڵكەرێكی باشت هەیە ئەی منداڵ"، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "ئەویش چ كۆڵكراوێكی باشە".

* * *

لە قۆناغی منداڵیی حوسەیندا، جارێكیان پێغەمبەر ﷺ لەباوەشی گرتبوو و، دەی لاواندەوە، لەو كاتەدا حوسەین باوەشی پێغەمبەری ﷺ تەڕكرد، شاڵاویان برد تا لێی وەربگرن، بەڵام پێغەمبەر لێنەگەڕا بیبەن و، پاشان دوای ئەوە داوای دەفرێك ئاوی كرد و تەڕاییەكەی پێ شۆردەوە.

* * *

ئیدی پێغەمبەر ﷺ نەوە نازدارەكانی بەم جۆرە خۆشدەویست.

- بۆچی هێندەی خۆشدەویستن؟

---

١- سنن الترمذي: ٥/٣٢٢.

تەنها لەبەر ئەوەی کە منداڵی فاتیمەی کچیی و عەلیی ئامۆزای بوون؟

یان لەبەر ئەوەی کە درێژەپێدەری وەچەی پیرۆزی بوون؟

یاخود لەبەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ زۆر بەسۆز و میهرەبانە؟

یان بۆ ئەوەی ببێتە نموونەیەك بۆ خەڵکی لە خۆشەویستی منداڵدا؟

یان ئەم خۆشەویستییەشی ئەرکێکی پێغەمبەرانە بوو؟

- بەڵێ، هەموو ئەم گریمانانە ڕاستن و لەجێی خۆیاندان، بەڵام خاڵی سەرەکی ئەوەی کۆتاییە.



حەسەن و حوسەین، زنجیرێکی نووراني و پەتێکی پرشنگداری میراتی پێغەمبەرایەتی بوون.

نەوەکانی حەسەن و حوسەین کە بە ئالوبەیت (ئەهلی بەیت) ناسراون، بەدرێژایی سەدان ساڵە هەڵگر و گوازەرەوەی پەیامی ئیسلامن.

حەسەن و حوسێن باوە گەورە و پشتی نەوەکانی ئەهلی بەیتی ئەمڕۆمانن، کە ملیۆنان کەس دەبن.

وەچەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگەی ئەم دوو کەسەوە زیادی کرد و، تا ئەمڕۆکەشمان هەر لە زیادبوون و بەرەکەتداربووندان و، تا ڕۆژی قیامەت بێ پچڕان بەردەوام دەبێت.

* * *

ماچکردنی سەری حەزرەتی حەسەن لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بەشێکی گەورەی شێخ (عەبدولقادری گەیلانی) تێدایە، چونکە شێخی گەیلانی نەوەی حەزرەتی حەسەنە و حەسەنیش کچەزای پێغەمبەر بووە ﷺ.

لە ڕاستیدا پێغەمبەر ﷺ بە چاوی پێغەمبەرانە لە حەسەن و حوسەینی ڕوانیوە و، گرنگی پێداون و، هاندەریان بووە.

بە خۆشویستن و ماچکردنی ملی حوسەین، خۆشەویستی خۆی بۆ نەوەکانی ئەویش دەربڕیوە.

خوای گەورە بە قودرەتی خۆی خزمەتی ئەم کەسێتییە مەزنانەی ئیسلامی پیشانی پێغەمبەر ﷺ داوە، بۆیە دەتوانین بڵێین پێغەمبەریش ﷺ بە شێوەیەکی واتایی (مەعنەوی) نەوەکانی بە سینەی پیرۆزیەوە گوشیوە و نازی پێداون.

لەبەر ئەمەیە خۆشویستنی ئەهلی بەیت خۆشویستنی نەوەکانی پێغەمبەرە ﷺ، چونکە ئەمە وەك ئەوەیە ڕاستەوخۆ سۆز و

خۆشەویستیت بۆ پێغەمبەر ﷺ دەربڕیت.. ئەم خۆشەویستییە دەمانگەیەنێت بە خۆشەویستی خوای گەورە.

ئاخر ئێمە ئەهلی بەیتمان تەنها لەبەر ئەوە خۆش دەوێت کە هۆکارن بۆ خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ.

بەم چەشنە تام و چێژی جوانیی ئیمان دەچێت بە دڵماندا و، چێژ لە باوەڕداریمان دەبینین و، خۆشبەختی تەنها لە بەندایەتی کردنی خودادا دەبینینەوە.[١]

---

١- لە (بریسکەی چوارەم)ەوە وەرگیراوە.

# چۆن سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ژیانماندا پەیڕەو بکەین؟



"هەریەك لە سوننەتە پیرۆزەکانی پێغەمبەر ﷺ و ڕەچاوکردنی ڕەویەی ئەوم وەك قیبلەنمایەك بینی کە ئاڕاستە و ڕێڕەوی کەشتییەکانی ناو دەریا دەستنیشان دەکات و، دەمبینی کە هەریەکەیان وەك چرایەك وایە چەندین ڕێی تاریك و زیانبەخشی لە ژمارەبەدەر ڕووناك دەکاتەوە".

– پێغەمبەرمان ﷺ چۆن قورئانی خوێندووەتەوە؟ ئەی چۆن لە ژیانیدا کاری بە ئایەتەکانی کردووە؟

ئازدارمان ﷺ چۆن پەروەردگاری پێ ناساندووین؟

پێغەمبەرمان ﷺ چۆن نوێژی کردووە؟ چۆن ڕۆژووی گرتووە؟ چۆن زەکاتی داوە؟

پێغەمبەرمان ﷺ چۆن پاڕاوەتەوە؟ چۆن یادی خوای کردووە؟ چۆن سوپاسی خوای کردووە؟

پێغەمبەرمان ﷺ چۆن قسەی کردووە؟ چی فەرمووە؟ لە کوێدا بێدەنگ بووە؟

پێغەمبەرمان چۆن نانی خواردووە؟ چۆن ئاوی خواردووەتەوە؟ چۆن هەستاوە و دانیشتوە و نوستووە؟

پێغەمبەرمان ﷺ پەیوەندی چۆن بووە لەگەڵ خەڵکیدا؟ چۆن گشت خەڵکی بەو ئەندازەیە خۆشویستووە؟

پێغەمبەرمان ﷺ چۆن دنیای بینیوە؟ چۆن لێی ڕوانیوە و هەڵیسەنگاندووە؟

هەموو ئەم پرسیارانە ئێمە بەرەو سوننەت دەبات.

* * *

کەواتە سوننەت بریتیە لە:

- ئەو ڕێبازە ئیسلامیانەیەی کە پێغەمبەرمان ﷺ لە ژیانیدا پەیڕەوی دەکرد.

- چۆنیەتی پەیڕەوکردنی ئیسلام لەلایەن پێغەمبەرمانەوە ﷺ.

- شێوازی هەڵسوکەوتی پێغەمبەرمان ﷺ، یا فلانە هەڵسوکەوتی لە چ کاتێك و کوێدا نواندووە؟

- شوێنکەوتنی پێغەمبەرمان ﷺ و، ناسینی کەسێتی پیرۆزی و، بە پێشەنگ دانانی.

- شوێنپێگرتنی پێغەمبەرمان ﷺ و، هەوڵدان بۆ ئەوەی وەك ئەو بژین.

سوننەت ڕۆح و دڵ و گیان و کرۆك و بناغەی ئیسلامە.

گەر سوننەت نەزانین ناتوانین لە ئاینی ئیسلام تێ بگەین.

گەر سوننەت نەزانین لە واتا و هۆکاری زۆرینەی شتەکان تێ ناگەین.

ئێمە بڕوامان بە بوون و یەکتایی پەروەردگارمانە، بەڵام شێوازی بەجێگەیاندنی فەرمان و داواکارییەکانی ئەو زاتە لە پێغەمبەرەکەمانەوە ﷺ فێر دەبین.

* * *

سوننەت قیبلەنمایەکە، نەخشەیەکە، ڕێبەر و ڕێنیشاندەرێکە.

لەبەر ئەمە بێ ئاشنابوون بە سوننەت، ناکرێت ڕێی ڕاست و دروست بدۆزینەوە.

ئەگەر مرۆڤ سەر لە سوننەت دەرنەکات، ئەوا ناشزانێت بەرەو کوێ دەڕوات و خەریکی چییە، بۆیە سەرلێشێواو و سەرگەردان دەمێنێتەوە.

خوای گەورەش بۆ ئەوەی مرۆڤ لە بێسەرەوبەرەییدا نەهێڵێتەوە لە ئایەتێکی پیرۆزی قورئاندا دەفەرموویێت:

(ئەی موحەممەد! بە خەڵکی ڕابگەیێنە و پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خوداتان خۆش ئەوێ پەیڕەوی من بکەن تا خودا خۆشتانی بوێ و لە گوناهتان ببووری. خودا تاوانبەخش و میهرەبانە) آل عمران: ٣١.

لەم ئایەتە پیرۆزەوە ئەم مژدە بەنرخانەمان پێ دەگات:

ئەگەر ئیمانتان بە خوای گەورە هەبێت، ئەوا بێگومان دەبێت خۆشتان بوێت.

مادەم خوداشتان خۆش دەوێت، ئەوا دەبێت بەوجۆرە ڕەفتار بکەن کە ئەو زاتە ویستی لەسەرە.

خوای گەورەش پێی خۆشە خۆتان بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ﷺ بچوێنن.

ئەمەش بە شوێنکەوتن و پەیڕەوکردنی ڕێبازەکەی ئەو دەبێت و، گەر شوێنکەوتەی ڕێبازەکەشی بوون ئەوا خوداش ئێوەی خۆشدەوێت.

کەواتە خوداتان خۆش بوێت، با خوداش ئێوەی خۆش بوێت.

* * *

ئەمە وەك ئەم نموونەیە وایە:

ئەگەر خۆر هەڵبێت ئەوا دەبێت بە ڕۆژ.

خۆر هەڵهات.. کەواتە ئێستا ڕۆژە.

گەر ڕۆژ نەبووەتەوە، کەواتە هێشتا خۆر هەڵ نەهاتووە.

هەروەك لەم یاسا گەردوونییەدا ڕوونمان کردەوە: ئەگەر خۆشەویستی خودا لە دڵی کەسێکدا هەبێت، ئەوا ئەو کەسە بێگومان شوێن خۆشەویسترین مرۆڤ لای خوای گەورە دەکەوێت.

ئەگەر ئێوە شوێنکەوتەی ڕێبازەکەی ئەو زاتە خۆشەویستە نەبن، کەواتە خوداتان خۆشناوێت.

خۆ ئەگەر خوداتان خۆشدەوێت، کەواتە ئێوە شوێن ئەو زاتە خۆشەویستە کەوتوون.

واتە هەر کەسێك ئیمانی بەخودا هەبێت، بێگومان دەشبێت گوێڕایەڵی بێت، ڕاسترین و کورتترین و گونجاوترین و بێگومانترین ڕێگەش ئەو ڕێیەیە کە پێغەمبەرمان ﷺ گرتوویەبەر و نیشانی ئێمەشی داوە و، بانگەوازی کردووین بۆی.

ئەنجام: بۆ ئەوەی خوای گەورە خۆشی بوێین، پێویستە شوێنکەوتەی سوننەتەکانی پێغەمبەرمان ﷺ بین و، لە ژیانماندا پەیڕەویان بکەین.[1]

---

١- لە (بریسکەی یازدەیەم)ەوە وەرگیراوە.

# زیندووڕاگرتنی سوننەتەکان چ سوودێکمان پێ دەگەیەنێت؟



پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: "هەر کەسێك لەو کاتەدا کە ئوممەتەکەم فەساد و خراپەکاری تێدا بڵاو بوو‌بێتەوە، دەست بە سوننەتەکانمەوە بگرێت، ئەوا پاداشتی سەد شەهیدی بۆ هەیە" .

– فەساد و خراپەکاری ئوممەت چۆن دەبێت؟

– بەوەی کە خەڵك بە ئاشکرا ڕوو لە گوناه و تاوان بکەن و، بێ شەرمانە دەست بۆ حەرامکراوەکان بەرن.

بێ شەرم کردن و سڵەمینەوە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی دوور لە ئەدەب و ڕەوشت بنوێنن.

بە ڕۆژی ڕووناك بێ فەرمانیی خوای گەورە بکەن.

واز لە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ بهێنن.

بە پێچەوانەی ڕێنماییەکانی سوننەتەوە بژین.

* * *

بیدعە، ئەو هەڵسوکەوت و کار و یاسایانەیە کە لەجێی سوننەت دانراون و لەگەڵ ئیسلامدا نەگونجاون.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هەموو بیدعەیەك گومڕاییە و، هەموو گومڕاییەکیش لە ئاگری دۆزەخدایە".

واتە یاسا و دەستوورەکانی شەریعەتی ئیسلام تەواو دامەزراون و، هیچ کەموکورتییەکیان تێدا نییە. هەموو لایەنەکانی سوننەتیش لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ دیاری کراوە.

لەبەر ئەمە ئەگەر خوانەخواستە ئیسلام و سوننەت بە ناتەواو ببینین و، شتی نوێی بۆ زیاد بکەین و، بیدعە دابهێنین، ئەوە سەرلێشێواوی و گومڕاییە.

لەبەر ئەمە زیندووڕاگرتنی سوننەتێکی بچووکیش لەناو ژینگەیەکی بە تاوان تەندراودا گرنگییەکی یەکجار زۆری هەیە.

- بۆچی؟

- چونکە تەنها مرۆڤی خاوەن ئیمانێکی ساغ و بەهێز دەتوانێت بە پێی سوننەتەکان بژی.

تەنها بڕوادارێکی بەتەقوا و لەخواترس دەتوانێت سوننەتەکان بەرز ڕابگرێت.

تەنها موسوڵمانێك کە خۆشەویستی خودا و پێغەمبەر ﷺ لە دڵیدا چەسپی بێت دەتوانێت بایەخ بە سوننەتەکان بدات.

کاتێك سوننەتێك بەجێدەهێنین یەکسەر پێغەمبەرمان ﷺ دێتەوە یاد، بیر لەو دەکەینەوە و، هەست دەکەین کە لەگەڵ ئەوداین.

کاتێك هەمان کارەکانی پێغەمبەرمان ﷺ ئەنجام دەدەینەوە، خۆشەویستی و دڵخۆشییەك لە ناخماندا سەرهەڵدەدات؛ چونکە نووری پێغەمبەر ﷺ لە ناخماندا هەڵدێت و دڵمان بە خۆشەویستی ئەو دەگەشێتەوە.

لەگەڵ یادکردنەوەی پێغەمبەرماندا ﷺ هەست دەکەین لە حزووری پەروەردگارداین و، هەست دەکەین خودا لێمانەوە نزیکە، لە ناخماندایە، لە دڵماندایە...

با بڵێین، بە دەستی ڕاستمان نان دەخۆین؛ چونکە دەزانین پێغەمبەرمان ﷺ کاتێك شتێکی خواردووە یان خواردووەتەوە دەستی ڕاستی بەکارهێناوە.

ئەم کارە هەرچەندە بە ڕواڵەت سادەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە لەپێناو زیندووڕاگرتنی سوننەتێکی پێغەمبەرماندا ﷺ بەو شێوازە ئەنجامی دەدەین، لە قاڵبی کارێکی سادە و ساکاردا نامێنێتەوە و،



دەبێتە پەرستش و، هەموو جارێك خێر و چاكەمان بۆ دەنووسرێت لەسەری.

بەم جۆرە ئەگەر هەموو كارەكانمان وەك سوننەتێك ڕاپەڕێنین و، هەر بەو شێوەیە بیانكەین كە پێغەمبەرمان ﷺ ئەنجامی داوە، ئەوا سەرتاپای ژیانی ڕۆژانەمان دەبێتە پەرستش و بیست و چوار سەعات خێر و چاكەمان بۆ دەنووسرێت.

ئاخ و، ڕواڵەت و، ماڵ و، دەوروبەرمان پڕدەبێت لە نوور و ئارامی و ئاسودەیی.. خوو و ڕەفتارەكانمان دەبن بە پەرستش و تەمەنمان بەرهەمدار دەبێت و لەبەرامبەریدا پاداشتمان بۆ دەنووسرێت.

* * *

سوننەتی پێغەمبەر ﷺ سێ سەرچاوەی هەیە، ئەوانیش:

(وتە و، كار و، حاڵ)ی پێغەمبەرمانە ﷺ.

وتە: فەرمودە پیرۆزەكانی پێغەمبەرە ﷺ .

كار: واتە ئەو كارانەی پێغەمبەرمان ﷺ كردوونی و، ئەو هەڵسوكەوت و ڕەفتارانەش كە نواندوونی.



حـــــــالّیش، بــــــارودۆخی پێغەمبـــــەرمان ﷺ و حاڵـــــە مرۆڤایەتییەکانی و ڕێڕەویەتی.

هـــــەر ســـێ سەرچـــاوەکەی سـوننەتیش دەبـن بـە سـێ پلـەوە، ئـــەوانیش: (واجـــب و، نـــەوافیل و، خووە جوانەکان).

– بۆ نموونە وەکو چی؟

– پێغەمبەرمان ﷺ نوێـژی کـردووە، ڕۆژووی گرتـووە، زەکـاتی بەخشیوە، گونـاهی ئـەنجام نـەداوە... ئـەم پەرستشـانە هەریەکـەیان واجب و فەرزێکە، کە پێویستە هەموو موسوڵمانێك جێبـەجێیان بکـات و هەرگیز پشتگوێیان نەخات.

بەم چەشنەش هەم فەرزێکمان ئەنجام داوە و، هەم لەبەر ئەوەی ئـــەو کارەمـــان کـــردووە کـــە پێغەمبـــەرمان ﷺ ئـــەنجامی داوە، سوننەتێکیشمان ئەنجامداوە.

لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەرمان ﷺ فـەرمانمان پـێ دەکـات بـەو شـێوازە نوێـژ بکـەین کـە خـۆی کردوویـەتی.. بـەم شـێوەیە لەگـەڵ ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکەدا سوننەتێکیشمان زیندووڕاگرتووە.

- چ سـوودێك لـە زینـدووڕاگرتنی سـوننەتەكانی پێغەمبـەر ﷺ دەبینین؟

- سەرەتا بـە ئەنجامـدانی ئـەم سـوننەتانە پاداشـتێكی زۆرمـان دەست دەكەوێت، بەڵام ئەگەر تەركیان بكـەین و پشـتگوێیان بخـەین، ئەوا لە دواڕۆژماندا گرفتار دەبین.

سـوننەتەكانیش بەشـی (نـەوافیل)یان هەیـە و، ئـەوانیش دوو بەشن:

بەشێكیان ئـەو سـوننەتانەن كـە تایبـەتن بـە پەرستشـەوە وەك: سوننەتەكانی تایبەت بە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و...

بـۆ نموونـە، لـە كـاتی دەزنوێژگرتنـدا ئـاو لـە دەم و لـووت ڕادان سوننەتە.

لـە كـاتی خوێنـدنی سـورەتی (الفاتحـة) لـە نوێـژدا دەسـتگرتن سوننەتە.

كاتێـك بـەڕۆژوو دەبـین هەسـتان بـۆ پارشـێو و ڕۆژوو شـكاندن سوننەتە.

ئـەم سـوننەتانە هـەرگیز گۆڕانیـان بەسـەردا نایـەت و، ئەگـەر بگۆڕدرێن ئەوا بیدعەیان تێدا هاتووەتـە كایـەوە، كـە ئەمـەش لەگـەڵ ڕێنماییەكانی ئیسلامدا ناگونجێت.



گەر ئەم سوننەتانە زیندوو ڕابگرین ئەوا پاداشتێکی زۆرمان دەست دەکەوێت، گەر تەرکیشیان بکەین هیچ سزا و ئازارێکمان لە چارە نانووسرێت.. بەڵام گەر بگۆڕدرێن و شتی نوێ لە جێیان دابنرێت، ئەوا بیدعەیە و هەڵەیەکی زۆر گەورەیە.

گەر لە کارەکانی ڕۆژانەماندا ڕەفتارە جوانەکانی پێغەمبەرمان ﷺ زیندوو ڕابگرین، ئەوا کارێکی زۆر باشمان کردووە و ژیانمان پێیان نەخشاندووە.

گەر بزانین پێغەمبەرمان ﷺ چۆن هەستاوە و دانیشتووە و، چۆن خواردوویەتی و، چۆن خواردویەتیەوە و، پاشان ئێمەش وەك ئەو ئەم کارانە بکەین، ئەوا خوویەکی زۆر جوان و شیرینمان لێ وەشاوەتەوە.

بەم جۆرە ئەم خووانەمان دەکەینە پەرستشێك.

نوور و بەرەکەتی پێغەمبەر ﷺ دێتە ناو ژیانمانەوە و ژیانێکی ڕۆشن و بەختەوەر دەبەینە سەر.[1]

---

١- لە (بریسکەی یازدەیەم)ەوە وەرگیراوە



## ئاكار و ڕەوشتی پێغەمبەرمان ﷺ چۆن بووە؟

"خوای گەورە هەرچی بناغە و دەستووری ئەدەب هەیە لە لای پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی خۆی ﷺ کۆی کردوونەتەوە، کەواتە هەرکەس سوننەت تەرك بکات و وازی لێ بهێنێت، ئەوا خۆی لە سەرچاوەی هەموو ئەدەبێك دوور خستووەتەوە" .

– ئەدەب یەعنی چی؟

– ئەدەب، ڕەوشتی جوانە.

ئەدەب بە باشی ژیانە لەگەڵ هەموو کەس و، بە جوانی قسەکردنە لەگەڵیان.

ئەدەب زمانی شیرین و ڕووخۆشییە.

ئەدەب نەرموونیانییە، بەڕێزەوە مامەڵە لەگەڵ خەڵك کردنە، ناتوندوتیژییە.

ئەدەب ناسکی و سادەییە.. دڵڕەق و هەستپووشێن نەبوونە.

ئەدەب دادپەروەرییە، بە یەکسانی مامەڵە لەگەڵ خەڵك کردنە و، دانی مافی هەموو شتێکە.

ئـەدەب میهرەبانییـە، بەسـۆزەوە لەگـەڵ خەڵکـدا جووڵانـە، دڵ بەدەستهێنانیانە.

ئەدەب دڵسۆزییە، خۆشەویستییە، هاوخەمیی و هاوبەشبوونە لـە ئازارەکانی خەڵکدا.

بە کورتی، ئەدەب هەر ڕەوشتێکە کە هەریەکەمان وەك مرۆڤێك حەزمان لێیەتی و، جوانییەکی مرۆڤایەتیانەیە.

پــەروەردگارمان، هــەموو شـێوەکانی ئــەدەبی لــە پێغەمبــەری نازدارماندا ﷺ کۆکردووەتەوە.

* * *

خوای گەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا ستایشـی ئـەدەب و ڕەوشـتی پێغەمبــەر ﷺ دەکـات و، دەفــەرموێت: (بەڕاســتییش تــۆ خــوو و ڕەوشتێکی زۆر گەورەیشت هەیە) القلم:٤.

واتە، خوای گـەورە بەتایبـەتی ستایشـی ڕەوشـتی پێغەمبـەرمان ﷺ دەکات و، بەرز دەینرخێنێت؛ چونکە خوای گەورە خۆی ڕەوشـتە مەزن و بالاکانی فێر کردووە.

پێغەمبــەرمان ﷺ دەفــەرموێت: "مــن پــەروەردگارم فێــری کردووم، بەڕاستی جوانترین ئەدەب و ڕەوشتی داداوم".

پێغەمبەرمان ﷺ لەلایەن پەروەردگارەوە ڕێی ڕاستی نیشان دراوە، واتە خوای گەورە بە شێوازی خۆی هەموو شتێکی فێر کردووە.

لەبەر ئەمە پێغەمبەر ﷺ لای هیچ کەسێك زانست و زانیاری فێر نەبووە، واتە لای پیاوانی ئایینی و لای زانایان نەیخوێندووە.

پەروەردگار هەموو شێوەکانی ئەدەبی لە پێغەمبەرماندا نەخشاندووە ﷺ، هەر لەبەر ئەمەشە کە ڕەوشت و ڕەفتاری ﷺ وەك موعجیزەیەکە بۆ مرۆڤایەتی و، هیچ کەس هێندەی ئەو ڕەوشت و ئەدەبی بەرز و بەڕێز نەبووە و نابێت.

بەڵام لەبەر ئەم ڕەوشت جوانییەشی هەمووان چاوی لێ دەکەن و هەوڵ دەدەن وەك ئەو هەڵسوکەوت بکەن و وەك ئەو ڕەفتار بنوێنن.



هەموو مرۆڤێك دەیەوێت ببێتە ئاوێنەی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ و، حەز دەکات ئەمیش بە ڕوانین لە ژیان و کەسێتیی نەخشە بۆ ژیانی خۆی دابڕێژێت، واتە هەوڵ دەدات لە ژیانی نوورینی ئەوەوە ژیانی خۆی ڕۆشن بکاتەوە و جوان و دەوڵەمەندی بکات؛ چونکە پێغەمبەرمان ﷺ لە هەموو ڕوویەکەوە ناوازە بوو، هەموو

هەڵسوکەوتێکی بەرز و، هەموو جووڵەیەکی لە لووتکەی پێگەیشتوییدا بوو و، لە هەموو ڕوویەکەوە لە بەرزترین ئاستی مرۆییدا بوو.

* * *

پێغەمبەرمان ﷺ لەگەڵ ئافرەتان و، منداڵان و، بێکەسان و، هەتیوان و، ئاژەڵانیشدا مرۆڤێکی زۆر بەبەزەیی و دڵنەرم بوو.

بە تایبەتی منداڵانی زۆر خۆشدەویست، هەروەك باسمان کرد: (حەسەن و حوسەین)ی کوڕی فاتمە و عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبی لە باوەش دەگرت و دەهات بۆ پێشنوێژی کردن بۆ موسوڵمانان لە مزگەوت و، لەسەر شانی دایدەنان و بە ڕێگادا دەڕۆیشت.

(ئەنەسی کوڕی مالیك)ی هاوەڵی لاوی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە:

"جارێك کاتێك پێغەمبەرمان ﷺ لە سوجدەدا بوو، حەسەن یا حوسێن هات و سوار کۆڵی بوو، پێغەمبەریش ﷺ سوجدەبردنەکەی درێژکردەوە تا ئەو هاتە خوارێ". هاوەڵان پاش تەواوبوون لە نوێژەکە لێیان پرسی: پێغەمبەری خوا، سوجدەکەتان زۆر درێژ کردەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "نەوەکەم هاتە سەر پشتم، منیش حەزم نەکرد پەلەی لێ بکەم".

ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لە کۆڵاندا منداڵی بدیایە، یەکسەر دەچووە لایان و سەلامی لێ دەکردن و، حاڵ و ئەحواڵی دەپرسین. گەر

نۆبـەرەی هـەر میوەیەکیشـی بـەدیاری بـۆ بهاتایـە سـەرەتا بەشـی منداڵەکانی دەدا.

پێغەمبەر ﷺ کەسێکی زۆر نانبدە و بەخشندە و سـەخی بـووە، زۆر چاودێری حاڵی هـەژارانی کـردووە و، پێداویسـتییەکانی بـۆ دابـین کردوون.

ئەگـەر یـەکێك بهاتایـە دەرگاکـەی و داوای شـتێکی لـێ بکردایـە، تەنانەت ئەگەر خۆشی پێویستی بەو شتە بووایە، هەر دەیبەخشی بەو کەسە و هەڵی نەدەگرت بۆ خۆی.

پێغەمبەر ﷺ هەر شتێکی دەستبکەوتایە دەیبەخشیەوە بەسـەر هەژار و لێقەوماواندا، لە ماڵەکەیدا هێندە کەلوپەل و شتی دنیایی شـك نەدەبرد.

پێغەمبەر ﷺ هەموو شتێکی لە پێناو خودادا دەبەخشی و هیچی بۆ خۆی نەدەشاردەوە.

پێغەمبـەر ﷺ کەسـێکی زۆر بـێ فیـز و خـاکی بـوو، هـەرگیز بـە لووتبەرزییـەوە تەماشـای کەسـی نـەدەکرد و، خـۆی لـە هـاوەڵانی جیانەدەکردەوە، بەڵکو وەك هاوڕێ و یەکێك لەوان دەژیا.

کاتێـك لەگـەڵ هاوەڵانـدا کـارێکی بـە کۆمـەڵیان بهاتایـە پـێش، یەکسەر کارێکی بۆ خۆی دیاریدەکرد.

جارێك پێغەمبەرﷺ و چەند هاوەڵێكی چوون بۆ سەفەرێك، لە ڕێگە ﷺ داوای لە هاوەڵان كرد كە مەڕێك سەرببڕن و بیبرژێنن، یەكێك لە هاوەڵان هات وتی: پێغەمبەری خودا، با مەڕسەربڕینەكە لەسەر من بێت. یەكێكی تر هات و وتی: پێغەمبەری خوا، من كەوڵی دەكەم. هاوەڵێكی دیكە فەمووی: من دەیبرژێنم.

بەم جۆرە كارەكانیان لە نێوان خۆیاندا دابەش كرد.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "دار و چیلكە كۆكردنەوەش لەسەر من بێت". بەڵام هاوەڵان ویستیان پێغەمبەر ﷺ ماندوو نەكەن و، پێیان وت: "پێغەمبەری خوا ئێمە دەتوانین ئەو كارەی ئێوەش ئەنجام بدەین، پێویست ناكات ئێوە كار بكەن".

لە بەرامبەر ئەمەدا پێغەمبەر ﷺ خاكی بوونی بێ سنووری خۆی نواند و فەرمووی: "دەزانم كە ئێوە دەتوانن ئەم كارەی منیش بكەن، بەڵام پەروەردگار حەزناكات بەندەی خۆی ببینێت خۆی لە هاوەڵان و دۆستانی خۆی جیا كردووەتەوە".

پێغەمبەر ﷺ زۆر نەرمونیان و بەڕێز بوو، زۆر ڕۆحێكی سووك و سادەی هەبوو.

دایە عائیشەمان (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت:

"هیچ کەسێك نییە کە ڕەوشتی لە پێغەمبەر ﷺ جوانتر بێت، هەر کەسێك بانگی لێ بکردایە دەیفەرموو: "بەڵێ فەرموو".

* * *

ئەنەسی کوڕی مالیك، کە دە ساڵی تەمەنی لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بەسەر بردووە، دەفەرمووێت:

"کاتێك یەکێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ بکردایە، زۆر بەجوانی گوێی بۆ ڕادەگرت و، تا پرسیارکەرەکەش خۆی نەڕۆیشتایە، پێغەمبەر ﷺ جێی نەدەهێشت.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ یەکێك تەوقەی بکردایە، یان یەکێك دەستی بۆ تەوقەکردن بەڕوویدا درێژ بکردایە، تا ئەو کەسە دەستی بەرنەدایە، پێغەمبەر ﷺ دەستی بەرنەدەدا.

کاتێك چاوی بەکەسێك بکەوتایە و قسەی لەگەڵ بکردایە، تا ئەو کەسە ڕووی وەرنەگێڕایە، پێغەمبەر ﷺ ڕووی وەرنەدەگێڕا.

هەرگیز قاچی ڕووەو کەسێك درێژ نەدەکرد کە لە بەردەمی دانیشتبێت، چاوی بە هەر کەسێك کەوتبێت سەرەتا ئەم سەلامی دەکرد و، دەستی بۆ تەوقەکردن بەڕووی کەسەکەدا درێژ دەکرد.

بۆخۆی خزمەتی میوانەکانی دەکرد، زۆرجار عەباکەی ڕادەخست بۆ ئەوەی لەسەری دابنیشن، زۆر جاریش ڕاخەرەکەی ژێر خۆی دەدا بە میوانەکان و خۆی لەسەر زەویە ڕووتەکە دادەنیشت".

جوانی و ڕەوشتبەرزی و ئەدەبی پێغەمبەرمان ﷺ بە باسکردن تەواو نابێت، چەندەها بەرگ لە کتێب لە بارەی ڕەوشتبەرزی ئەوەوە نووسراون، هەزاران کۆڕ بەستراون و، هەزاران شیعر لەبارەیەوە هۆنراونەتەوە.

ئای! چەند خۆشە بۆ ئێمە کە پێغەمبەرێکی وامان هەیە.[1]

---

١- لە (بریسکەی یازدەیەم)ەوە وەرگیراوە.

# ئێمە تا چەند هاوەڵان (الصحابة) دەناسین؟



کاتێك دەوترێت (هاوەڵان) وێنەی ئەو کەسانە بە بیرماندا دێت
کە لە کۆڕەکانی پێغەمبەردا ﷺ ئامادەبوون و، بە چاوی خۆیان
ئەویان بینیوە و گوێیان بۆ گرتووە و هاوەڵ و دۆستی بوون و،
باوەڕیان بە پەیامەکەی هێناوە.
پێغەمبەرمان ﷺ چی فەرموو بێت و، باسی هەرچییەکی کردبێت
و، لە هەر شتێك دوابێت، ئەمان (خوا لێیان ڕازی بێت) بێ
دوودڵی وتوویانە: "سەر سەر و سەر چاومان".

هاوەڵان پێغەمبەریانﷺ زۆر خۆشویستووە و، ئامادەبوون گیانی خۆیان بکەنە فیدای.. لە ڕاستیدا هیچ کەسێکیان هێندەی ئەو زاتە خۆش نەویستووە، تەنانەت کەس و دۆستە زۆر نزیکەکانیشیان هێندەی پێغەمبەر ﷺ خۆش نەویستووە.

هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) پێغەمبەریان ﷺ لە دایك و باوك و، ماڵ و منداڵ و، خوشك و برا و هەموو کەسێکیان زیاتر خۆشویستووە، بۆیە هەر کاتێك پێغەمبەر ﷺ بانگی هەر یەکێکیانی کردبێت، لە وەڵامیدا وتوویەتی: "دایك و باوکم بەفیدات بن! فەرموو پێغەمبەری خودا"

ئەو ناوانەی کە هەرکات باسی هاوەڵان بکرێت دێتەوە خەیاڵمان ناوی (ئەبوبەکر، عومەر و، عوثمان و، عەلی و، طەلحە و، زوبێر، بیلال، حەمزە، عەبباس...)ە.

لە ئافرەتانیشدا ناوی خاتوو (خەدیجە و، عائیشە و، فاتیمە و...) دێت بە خەیاڵماندا.



هاوەڵان پێش موسوڵمانبوونیان کەسانی ئاسایی بوون، تەنانەت زۆربەیان نەزان و نەفام و شەڕانی و دڵڕەق بوون و، بێ هیچ شەرم و حەیا و سڵەمینەوەیەك هەموو جۆرە کارێکی ناحەز و

ناشـیرینیان دەکـرد. هەنـدێکیان هێنـدە دڵـڕەق بـوون کـە کچـەکانی خۆیان زیندەبەچاڵ دەکرد!

بـەڵام کاتێـك پێغەمبـەریان ناسـی و، هاتنـە باوەشـی ئـایینی ئیسلامەوە، سۆز و میهرەبانییـەکی وا لـە دڵیانـا چەسـپی کـە ئـیتر زیانیان بە مێرووڵەیەکیش نەدەگەیاند.

واتە کەسـانێك کـە ڕابردوویـەکی وا نەزانانـە و تاریکیـان هـەبوو، پاش موسوڵمانبوونیان هەموو خەمێکیان ئەوەبوو لە کـۆڕ و کۆمـەڵ و دانیشتنەکانی پێغەمبەردا ﷺ ئامادە بن، تا زیاتر و زیاتر بـە ئیسـلام شەرەفمەند بن، لە دواتریشدا پێغەمبـەر ﷺ زۆرینـەیانی بـۆ وڵاتـانی دوورەدەسـتی وەك (چـین و هیندسـتان) دەنـارد، تـا خـەڵکی فێـری ڕەوشتی بەرز و مرۆییانە و هۆشیارانە بکەن.

ئەم هاوەڵە بەڕێزانە (خوا لێیان ڕازی بێت) دڵ و چاو و مێشکیان هەر لای پێغەمبەر بوو ﷺ و، هەتا بیانتوانیایە لە پێغەمبەر ﷺ دوور نەدەکەوتنەوە و، هەرگیز نەیاندەویست دەوری چۆڵ بکەن.

هـەر کـات ئایـەتێکی قورئـانی پـیرۆز بـۆ پێغەمبـەرﷺ ڕەوانـە بکرایـە، یەکسـەر ئـەمان لەبـەریان دەکـرد و، ئەگـەر گوێیـان لـە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ بووایە یەکسەر ئەویشیان لەبەر دەکرد.

* * *

لەو سەردەمەدا ئیمان و کوفر و، چاکە و خراپـە و، ڕاسـتی و درۆ هێنـدەی مـاوەی نێـوان زەوی و ئاسمـان و بەهەشـت و دۆزەخ لەیـەك دوور بوون، واتـە هـاوەڵان چـەندێك لـە کـوفر هـەڵ دەهـاتن و خۆیـان دەپاراسـت، هێنـدەش لـە درۆ و ڕەوشـتی خراپـی بـاوی ئـەو دەم و زەمانە هەڵ دەهاتن.

چونکە درۆ پیشەی ڕقنەستوور و نکوڵیکارانـە، تـەنها کافرەکـان درۆیان لەگەڵ خۆیان و خەڵك دەکرد، تـەنها ئـەوان بـوون کـە خـودا و پێغەمبەرەکـەیان ﷺ بـەدرۆ دەزانـی، بۆیـە مرۆڤـی درۆزن لـەدنیادا پەرێشان و لە دواڕۆژیشدا لارەمل و سەرشۆڕ و ڕەزیل دەبێت، چـونکە درۆ مرۆڤ بەرەو دۆزەخ ڕادەکێشێت.

بێگومان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) پـاش موسـوڵمانبوونیان درۆیـان نـەدەکرد، یـا هـەر نـەیان دەتـوانی بیکـەن و، تەنانـەت بەخەیاڵیشیاندا نەدەهات کە درۆ بکەن.

هـەرگیز درۆ لەگـەڵ ژیانیانـدا تێکـەڵ نـەدەبووە، دەمـردن بـەڵام درۆیان نەدەکرد، واتە مردنیان بەسەر درۆکردنیان هەڵدەبژراد.

چـونکە ئیمـان ڕاسـتییە، ڕاسـتگۆییە و، خـوای گـەورە هەمیشـە هەواڵی لەبارەی ڕاستییەکانەوە داوە و، پـەیامی ڕاسـتی و حـەقی بـۆ پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە تا ئەوانیش بە ئێمەی ڕابگەیەنن.

پێغەمبەرمان ﷺ هەمیشە ڕاستی فەرمووە، تەنها ڕاستگۆکانیش دەتوانن بچنە بەهەشتەوە.

یەکەمین هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ و، ئەو پیاوەی لەڕیزی پێشی پێشەوەی هاوەڵاندا دێت، ئەو هاوەڵەی کە خودا زۆری خۆشدەوێت (ئەبوبەکری صدیق) بوو (خوا لێی ڕازی بێت).

گەورەترین تایبەتمەندی ئەو هاوەڵە ئەوە بوو کە کەسێکی ڕاستگۆ و، موسوڵمانێکی زۆر سەرڕاست و ڕاستبێژ بوو.

پێغەمبەر ﷺ هەرچییەکی بفەرموایە، یان هەر شتێکی لەبارەوە بوترایە، ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) بێ دوودڵی باوەڕی پێ دەهێنا.

لەبەر ئەمە پێغەمبەر ﷺ نازناوی (الصدیق) واتە (ڕاستگۆ)ی پێ بەخشیبوو، چونکە ئەم هاوەڵە بەڕێزە هەرگیز لە ژیانیدا توخنی درۆ نەکەوتبوو.

* * *

مەزنترین سیفەتی هاوەڵان ئەوە بوو کە هەردەم لەبیری بە دەستهێنانی ڕەزامەندی خودادا بوون.

هەمیشە دەیان وت: "چی بکەین تا خوای گەورە لێمان ڕازی بێت؟ چۆن هەستین و دانیشین تا بە ڕەزامەندی خودا بگەین؟ پەروەردگارمان چی لێمان دەوێت؟ چ کارێکی لا خۆشەویستە؟".

هەموو خەم و هیوا و ئازاریـان تـەنها بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی خوایی بوو و، هەمیشە بیروهۆشیان لای ئەوە بوو.

لە بیر و هزر و ژیـانی هاوەڵانـدا جگـە لەمـە هیچـی دیکـە بـوونی نەبوو.

ئەمە لە کاتێکدا کـە ئـەوانیش وەك هـەر کەسێکی ئاسـایی لـەم دنیایەدا ژیاون و، خاوەن ئیش و کار بوون.

هەنـدێکیان بازرگـان و، هەنـدێکیان جوتیـار و، هەندێکییشـیان خاوەن پیشە بوون.

زۆربەیان خاوخێزاندار بوون و، ماڵ و منـداڵیان هـەبوو و، کاریـان دەکرد و، هەوڵیان دەدا و تێدەکۆشان تا بژێوی ژیانیان دابین بکـەن، بەڵام دەستیان بە هەر کارێك بکردایـە ڕەزامەنـدی خودایـان دەکـردە بناغە بۆ دەستبەکاربوونیان.

هەر کارێك کـە خـوا پێـی خـۆش نـەبێت و، قەدەغـەی کردبێـت، ئەمان (خوا لێیان ڕازی بێت) هەرگیزا و هەرگیز بەلایدا نەدەچوون.



دنیایان لەبەر ئەوە خۆشدەویست کە بەدیهێنراوی خودایە.. هەر بوونەوەرێکیشیان بدیایە خودای بیردەهێنانەوە.

وەك ئاوێنەی ڕەحمەتی خوایی لە هەموو بوونەوەرێکیان دەڕوانی.

هەموو شتێك ئەوانی بەرەو ڕەزامەندی خوایی پەلکێش دەکرد؛ چونکە دڵنیا بوون دنیا و هەموو بوونەوەران موڵك و سامانی خودان و، پێناسەیەکن بۆ قودرەت و کاربەجێی ئەو زاتە.

بەم شێوەیە لای ئەوان کارکردن بۆ دنیا و بەڕێکردنی کاروبارەکان، بە واتای کارکردن دەهات لەناو موڵکی خوای گەورەدا.

چۆن لەکاتی پەرستشەکاندا خودایان دەهاتەوە بیر و یادیان دەکردەوە، بەهەمان شێوەش لەکاتی کارکردندا خودا لە دڵ و

دەروونیـان دەرنەدەچـوو؛ چـونکە دڵنیـا بـوون ئـەم دنیایـە کێڵگـەی دوارۆژە، واتــە ئـەوەی لێـرە دەیکـەیت و دەیچـێنیت لـە بەهەشـتدا بەروبەرهەمەکەی دەچنیتەوە.

* * *

لـە ڕاسـتیدا ئێمـە زۆر قـەرزاربارى هـاوەڵانین (خـوا لێیـان ڕازی بێـت)، ئـەوان منـەتیان زۆر بەسـەرمانەوە هەیـە، بۆیـە باشـتر وایـە هەمیشـە بـە سوپاسـەوە یادیان بکەینـەوە و، لـە دڵمانـدا جێگـەیان هـەبێت و، هـەرگیز لـەبیریان نەکـەین و، هـەردەم بـەڕێزەوە باسـیان بکـەین؛ چـونکە ئـەوان بناغەدانـەر و سـەرەتاکانی ئیسـلام و موسوڵمانێتین.. موسوڵمانە یەکەمینەکانن.

یەکەمین باوەڕدار بە خودا پاشان بە پێغەمبەرن ﷺ.

هەمیشە ئەوان لە ڕیزی پێشەوەدان.



لـــە هــــەموو بابەتێکدا ڕابـەرن، لـە هـــــەموو کارێکـــــدا سەرمەشـــــــق و پێشڕەومانن.

هــــەر لەبـــەر ئەمەشە کە تا کۆتایی

دنیا لە پاداشتی هەموو موسوڵمانێکدا بەشی ئەوانی تێدایە؛ چونکە هەر کەسێك پێشەنگی کاری چاکە بوو، ئەوا بەقەد پاداشتی هەموو ئەو کەسانەی شوێنی کەوتوون چاکە و پاداشتیش بۆ ئەم دەنووسرێت.

– بەڕاست.. ئەو هەموو پاداشتە زۆر نییە؟

– نا، ئاخر ئەو خزمەتەی ئەوان لەکاتی خۆیدا پێشکەشی ئیسلام و موسوڵمانانیان کرد کەم نەبوو و، بچووك و سادە و ساکار نەبوو، بەڵکو زۆر مەزن بوو، یەك نەبوو بەڵکو هەزار و هەزاران بوو...

هەر لەبەر ئەمەشە هیچ کەسێك لە کاروکردەوەی چاکدا بە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) ناگاتەوە؛ چونکە بۆ ئەوەی پێیان بگەینەوە دەبێت ئێمەش ببین بە هاوەڵ! ئەمەش خۆ ناگونجێت و ڕێی تێ ناچێت.[1]

١– لە (وتەی بیست و حەوتەم)ەوە وەرگیراوە.



# خوشەویستی و برایەتی ئایینی چیە و چۆن دەبێت؟

خۆشەویستی هەستێکی زۆر جوان و ناوازەیە کە خودا لە دڵەکاندا بەدیهێناوە.

خۆشەوستی ئەو هەستەیە کە ئێمە وابەستەی ژیان دەکات و، ژیانمان دەڕازێنێتەوە.

خۆشەویستی هۆی بەردەوامبوونی ژیان و بوونمانە.

هەر بەم هەستە سەرەڕای خۆشویستنی خودا، بڕوادارانیشمان خۆشدەوێت، واتە هەموو موسوڵمانان و بڕواداران خوشك و برای دینیمانن، بۆیە ئێمەش خۆشماندەوێن.

چونکە لەگەڵ ئەو کەسانەدا باوەڕ و ئیمانمان یەکە.

دڵەکانمان بەهەمان باوەڕەوە لێ دەدات و، ناخ و دەروون و سینەمان بەهەمان جۆش و خرۆشەوە دەهەژێت.

هەر مرۆڤێك باوەڕ لە دڵیدا بچەسپێت بەشێوەیەكی سروشتی خۆشەویستی هەموو بڕوادارانی تریش دەچێتە دڵیەوە، هەر دەشبێت خۆشیبوێن...

چونكە خوای گەورە خۆی ئێمەی كردووەتە خوشك و برای یەكتر، ئەوەتا لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: (ئەوانەی ئیمانیان بە خوا و بە پێغەمبەری خوا هەیە برای یەكن) الحجرات:١٠.

خوشك و براش پێویستە یەكتریان خۆش بوێت و، دوژمنایەتی یەكتر نەكەن و، لە ئاست یەكدی كینەلەدڵ نەبن و، ئیرەیی (حەسودی) بەیەك نەبەن و، ڕوو لە یەكتر وەرنەگێڕن و پشت لەیەك نەكەن و، خراپە لەگەڵ یەك نەكەن و، هەرگیز زیانی یەكتریان پێ خۆش نەبێت.

هەروەها گەر برا یا خوشكێكی موسوڵمان خوویەكی ناشیرین یا خراپی هەبوو، ئەوا نابێت ئێمەی باوەڕدار ڕقمان لێی بێت و، ئیتر قسەی لەگەڵ نەكەین.

ڕەنگە برایەك یا خوشكێكمان خوویەكی هەبێت كە بە دڵی ئێمە نەبێت و پێی پەست بین، بەڵام خۆ لە پاڵ ئەو خووە خراپەیدا هیچ نەبێت نۆ دانە خووی باشی هەیە.

کەواتە ناگونجێت لە بەرامبەر نۆ ڕەوشتی باشیدا هەر تەماشای ڕەوشتێکی خراپی بکەین، بەڵکو پێویستە گەر ئەو خووەشمان زۆر بە زەقی لێ بینی ئەوا لەبیر خۆمانی ببەینەوە.

نموونەیەك:

کەشتییەك بێنە بەرچاوت کە نۆ کەسی چاك و بێتاوانی تێدایە، بەڵام کەسێکی خراپ و بەدکاریشی تێدایە، خۆ ناکرێت بڵێین: وەڵا لەبەر ئەوەی ئەو کەشتییە یەك کەسی خراپی تێدایە، کەواتە دەبێت نوقمی بکەین!

ڕاستە کەسە خراپەکە تاوانبار و بەدکارە، بەڵام خۆ نۆ کەسی بێتاوانی دیکەش لە کەشتییەکەدان، بۆیە لەبەر خاتری ئەو نۆ کەسە زیان بە کەشتییەکە ناگەیەنین.

هەروەك ئەم نموونەیەی باسمان کرد: دەگونجێت برایەکی دینیمان هەڵوێستێکی هەبێت کە بەدڵی ئێمە نەبێت، یان پێچەوانەی بیروڕای ئێمە بێت، بۆیە ناشێت تەنها لەبەر ئەو خووە ناشیرینە دژایەتی هاوەڵەکەمان بکەین؛ چونکە ئەو نۆ ڕەوشتی بەرزی تر و ڕەنگە زیاتریشی تێدا بێت.

بۆ نموونە، موسوڵمانە، ئیماندارە، هاوڕێیەکی باشە، حەزی لە هاوکاری کردنی کەسانی ترە، ڕووخۆشە، تێکۆشەرە، دراوسێیەکی باشە، مرۆڤێکی بەڕەوشتە، داوێنپاکە...

دژایەتیکردنی برا یا خوشـکێکمان لەسـەر یـەك خـووی ناشـیرین، لەکاتێکدا ئـەم هـەموو خـووە باشـەی هەیـە، وەك ئەوەیـە بـە وێنـەی کەشتییەکە لەناوی بەریت.

* * *

ڕەنگە لەگەڵ برایەکی زۆر خۆشەویستماندا لەسەر بابـەتێك ڕێـك نەکەوین، لەبەر ئەوەی هەریەکەمان قەناعەت و ڕای جیـاواز و تایبـەت بەخۆی هەبێت، خـۆ ئەگـەر بـێین تـەنها لەبـەر جیـاوازبوونێکی سـادە پەیوەندیمان بپچڕێنین، ئەوا کارێکی ناژیرانە و نادروستمان کردووە.

هەروەك ئەگەر چەند بەردەوردەیەکی بێ نرخ بە گەورە بزانیـت و پێت وابێـت لـە (کەعبـە) پیرۆزتـر و لـە کێـوی (ئوحـود)یش گـەورە و بەرزترن، ئەوا یەکسەر بە نەفام دادەنرێیت.. هـەر بـەو جـۆرەش گـەر چەند هەڵەیەکی ساکاری کەم نرخ و بـێ بایـەخی وەك بـەردەوردەکان لـە براکەتـەوە دەربکـەوێت و، تـۆ لـە ئیمـان و موسـڵمانێتییەکەی بەقورستر و گەورەتری بزانیت –کە وەك کەعبە و کێوی ئوحود بەرز و گەورەن– ئەوا ئەم کارەی تۆش بە هەمان جـۆر بـە کـارێکی نەفامانـە دادەنرێـت.

واتە ناشێت لەبەر خوویەکی خراپی کە هێنـدەی دەنکـە چـەوێکە نرخـی پەیوەنـدی و دۆسـتایەتیتان لـەناو بـەریت و لێـی زویـر ببیـت. چونکە:

خــــودای هــــەردووکتان یەکێکـــە.. بەدیهێنــــەرتان یەکێکـــە.. ڕۆزیـدەرتان یەکێکـە.. پێغەمبـەرتان یەکێکـە.. ئاییننتـان یەکێکـە.. قیبلەتان یەکێکە.. وڵاتتان یەکێکە.. میللتتان یەکێکە...

بێگومان ئـەم هـەموو (یـەك)ە هـەوێنی یـەکڕیزی و، هاوکـاری و، هاوخەمی و، خۆشەویستی و برایەتیمانە.

کەواتـە نابێـت ڕێ بـدەین هـیچ شـتێك جیاکـاری و دڵشـکاوی و زویربوون و تورەبوون لە نێوانماندا بسازێنێت...[1]

---

١- لە (مەکتووباتی بیست و دووەم)ەوە وەرگیراوە.

# پێویست دەكات هەموو ڕاستییەك بڵێین؟



"پێویستە هەموو قسەیەکت حەق بێت، بەڵام بۆت نییە
هەرچی حەقێك دەزانیت بیلێیت و بلاوی بکەیتەوە.
هەروەها پێویستە هەموو وتەیەکت ڕاست بێت، بەڵام وتنی
هەموو ڕاستییەکیش کارێکی دروست و ڕەوا نییە".

– باشە (حەق) چییە؟

– ئەو شتانەیە کە ڕاست و دروستن، واتە دوورن لە درۆ و هەڵە و خراپە و بیرە پووچەکان.

ئیسلام ئاینێکی حەقە، قورئان پەرتووکێکی حەقە، پێغەمبەرمان ﷺ پێغەمبەرێکی حەقە، فریشتەکان حەقن، بەهەشت و دۆزەخ حەقن و، ئێمەی موسوڵمان لە بوونی ئەمانە و حەقبوونیان بچووکترین گومانمان نییە.

- ئەی (قسەی حەق) چییە؟

- واتە وتەی ڕاستیی، ئەو وتانەی سوود بە خەڵك دەگەیەنن.

پێش هەموو شتێك وتەكانی خودا لە هەموو وتەیەك حەقترە، پاشان وتەكانی پێغەمبەر ﷺ، دوای ئەویش وتەی هاوەڵان و پیاوچاكان حەقە.

مرۆڤی باش هەمیشە لایەنگری حەق و ڕاستییە و، كاتێك قسە دەكات ڕاستییەكان دەڵێت و، قسەی ڕاست و ڕەوا دەكات، واتە قسەی ناشیرینی بە زماندا نایەت و، قسەی خراپ و ناڕەوا ناكات.

ئەو شتانە باس دەكات كە بە حەق و ڕاستی دەزانێت و باوەڕی پێیەتی. هەرگیز خۆی نادات لە قەرەی باسكردنی شتێك كە بە ڕاستی نەزانێت و لەگەڵ قەناعەت و بیروباوەڕیدا نەگونجێت و، دڵی پێی ڕازی نەبێت.



مرۆڤ پێویستە هەمیشە لایەنگری ڕاستی بێت و، ڕاستیش بڵێت، هەروەها خۆی بەدوور بگرێت لە لایەنگری هەڵە و ناهەقی و شتێك كە بڕوای پێ نەبێت.

* * *

یەكێك لە ناوەكانی خوداش (الحق)ە، بەڕاستی ئەو زاتە خودی حەقە، هەموو حەق و ڕاستییەكان لە زاتی موبارەكییەوە سەرچاوە دەگرن.

لەبەر ئەوە پێویستە قسە و وتەكانمان، تەنانەت ئەو شتانەش كە گوێیان بۆ دەگرین، بە شێوازێك بن كە خودا لێیان ڕازی بێت و، بەپێی ویست و ڕەزامەندی ئەو زاتە بن.

ئیتر ئەو كاتە حەق دەڵێین و، لایەنگری حەق دەكەین و، دەبینە كەسێكی ڕاستگۆ و حەقبێژ.

بەڵام چۆن هەموو شتێك شوێن و كاتی دیاریكراوی خۆی هەیە، حەق وتنیش شوێن و كاتی خۆی هەیە.

ڕۆژێك لە قوتابخانە لە پۆلدا دانیشتوویت و، وانەی بیركاریتان هەیە، مامۆستاش لەسەر تەختەكە شیكاری پرسیارێكتان بۆ دەنووسێت، لەو كاتەدا تۆ دەستت بەرز كردەوە و ویستت پرسیارێك بكەیت و، مامۆستا ڕێگەی پێدایت، كەچی وتت: "مامۆستا! (لا اله الا الله) یەعنی چی؟"

– باشە ئەوەی كە وتت ڕاستە؟

– بە دڵنیاییەوە كە ڕاستە.

– حەقە؟

– حەقە.

– هیچ هەڵەیەکی تێدایە؟

نەخێر، چونکە شەهادەیە، واتە "جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێك بە حەق شایەنی پەرستن نییە".

بێگومان مامۆستاکەت لە وەڵامدا دەڵێت: "ڕۆڵە ئێستا کاتی ئەم پرسیارەیە؟ ئەمە چ پەیوەندییەکی بە وانەکەمانەوە هەیە؟"

هەرچەندە تۆ حەق و ڕاستت وت، بەڵام لەبەر ئەوەی پرسیارەکەت لە کات و شوێنی خۆیدا نەبوو هەڵەت کرد، هەر بۆیە لە کاتێکدا چاوەڕوانی بە ڕێزەوە وەڵامدانەوەی بەرامبەرەکەت بوویت، کەچی شەرمەزار بوویت.

* * *

<u>نموونەیەکی دیکە:</u>

سوار پاسێك بوویت و دەچیت بۆ سەفەرێك، کەسێك لە تەنیشتتەوە دانیشتووە، کە نایناسیت و نازانیت خاوەن چ بیروباوەڕێکە و، هیچ بە سروشتیی کەسایەتیشی ئاشنا نیت.. بەڵام هەر ئەوەندە ناوەکەیت زانی و لەگەڵ ئەو جێیەی کە بۆی دەچێت، ئیتر یەکسەر دەستت کرد بە باسکردنی بابەتی یەکتایی خودا و ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ و فەرموودە و ئایەت و، هەرچیەکت زانی بۆت هەڵڕشت...

ئەویش کەمێك گوێی لێ گرتبێت، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت دەستی کرد بە ڕەخنەگرتن و ڕووبەڕووت بوویەوە.. لە ئەنجامدا کەوتنە موناقەشە و، خەریك بوو کار بگاتە دەمەقاڵێ و شت.

- ئێستا ئەوەی تۆ باست کرد حەق بوو؟

- بەڵێ حەق بوو.

- هیچ هەڵەیەکی تێدا بوو؟

- نەخێر.

- کەوابوو کابرا بۆ لە خۆیەوە هەڵچوو؟

لە ڕاستیدا پیاوەکە دژی خۆت وەستایەوە و، ڕەخنەی لە شێوازەکەت گرت، نەك لەوەی کە باست کرد؛ چونکە با تۆ باسی حەق و ڕاستیشت بۆ کردبێت، بەڵام ئەوێ جێگا و کاتی ئەوە نەبوو.

جگە لەوەش بێ ئەوەی ڕاوبۆچوونی کابرا بزانیت، یەکسەر قسەوباست کردەوە لەگەڵی، کەوابوو لە کاتێکدا تۆ ویستت قسەی ڕاست و حەقی بۆ بکەیت کەوتیتە باری ناحەقیەوە.

* * *

نموونەی سێیەم:

هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستت هەیە و، یەکتریتان زۆر خۆشدەوێت، بەڵام ئەو نوێژ ناکات.. تۆش هەر جارێك دەیبینیت دەست پێدەکەیت: "بۆچی فەرمانی خوا بەجێ ناهێنیت؟ موسوڵمان

نابێت نوێژ نەکات؟ هەر کەسێك دوو ڕکات نوێژی بچێت ئەوەندە ساڵ لە دۆزەخدا دەسوتێت"..

وتەکانت هیچ هەڵەیەکی تێدایە؟

- نەخێر.

- حەقە؟

- حەقە.

بەڵام خۆ ڕاستییەکان بەم جۆرە باس ناکرێن. بە تاوانبارکردنی بەرامبەر و بەچاودادانەوەی کەموکورتییەکانی و، دڵشکاندنی و، بە ئاگری دۆزەخ ترساندنی... و ئەمانە، قسە و ئامۆژگارییەکانت نە جێی خۆیان دەگرن و نە هیچ کاریگەریشیان دەبێت، سەرەڕای ئەوەی کە دۆستایەتییەکەشتان کاڵ دەبێتەوە و دەشێوێت و گەرد لە دڵتان دەنیشێت. بەم شێوەیە تێگەیشتین کە: دەبێت هەرچییەکمان وت حەق بێت، بەڵام نابێت هەموو حەقێکیش بڵێین.

هەروەها: "با هەموو وتەیەکت ڕاست بێت، بەڵام هەموو ڕاستییەك مەڵێ".

ڕاستی وتن کارێکی درووستە، بەڵام وتنی ڕاستیش لە جێی ڕاستدا بۆخۆی ڕاستییەکی دیکەیە.

- یەعنی چی؟ بۆ جێگەش هەیە ڕاست نەبێت ڕاستیی تێدا بوترێت؟

باسێك هەیە دەڵێت: لە سەردەمانی كۆندا، لە شارێكدا فەرمانبەرێك هەبوو بە ناوی (دۆروجو داود) واتە (داوودی ڕاستگۆ)، ئەم پیاوە هەر هەڵەیەك یان شتێكی بدینیبایە كە بەدڵی نەبووایە، بەڕووی هاوڕێكانی و تەنانەت بەڕێوبەرەكەشیدا دەدایەوە.

ڕۆژێك كۆمەڵێك فەرمانبەر، كە بەتەواوی لەم خووەی بێزاربووبوون، چوون بۆلای دادوەر (قازی) و سكالآیان لەدەست دەربڕی، وتیان: "جەنابی قازی، تكایە ئەم (دۆروجو داود)ە لێرە شاربەدەر بكەن، كە هەر خەریكی ڕاست وتنە"!

دادوەریش لەدوای گوێگرتنی بۆ سكالآكەیان وتی:

"ئەوە ئێوە ئەڵێن چی؟ ئێمە لێرە هەموو هەوڵ و تەقەلایەكمان بۆئەوەیە كە ڕاستی و حەق بهێنینە گۆڕێ و بەرقەراری بكەین و، حەق و ناحەق لەیەك جیا بكەینەوە".



پاشان سکالآکارەکانی بەدەستی خالّی ڕەوانە کردەوە.

لەدوای ماوەیەك هەمان کۆمەڵ دووبارە چوونەوە لای قازی و شکاتیان لە (دۆروجو داود) کردەوە و، وتیان: "جەنابی قازی، چی دی بەرگە ناگرین و، ئەبێ چارەیەکمان بۆ بدۆزیتەوە".

پاش ئەمە قازی زۆر مەراقی بوو بزانێت ئەم پیاوە کێیە، بۆیە داوای کرد کە (دۆروجو داود) ببینێت.

(دۆروجو داود)یش هەر لەگەڵ چووە لای قازی وتی: "سلآوتان لێ بێت جەنابی قازی چاو خێل".

لە ڕاستیدا قازی هەر کە لەدایك بووبوو بە زگماکی چاوەکانی خێل بوون، بۆیە بەم قسەیەی ئەو زۆر خەفەتی خوارد و پیشێکی خواردەوە و، وتی: "ئەوەنەش ڕاستگۆیی باش نییە"و، دواتر بڕیاری دا (دۆروجو داود) لەسەر کارەکەی لابدات.

(داوود)یش دەستی کرد بە پاڕانەوە لە قازی و، لە لایەکی دیکەشەوە وەك بەرگرییەك لە خۆی وتی:

"جەنابی قازی! خۆ من شتێکی هەڵەم نەوتووە، تەنها بە ئێوەم وت: (خێل)، مەگەر چاوی ئێوە خێل نییە؟"

بەڵام کەس دادی نەدا و، بەم جۆرە لەسەر زیاد لەپێویست ڕاشکاوبوونی سزا درا و، لە کاروکاسپییەکەشی بێ بەش بوو.

* * *

زۆر کەس تەنها بۆ ئەوەی پێیان بوترێت: ڕاستی وتووە، خۆیان چارەڕەش دەکەن، بەڵام خۆ ناکرێت هەموو ڕاستییەك لە هەموو شوێنێکدا بوترێت.

لەبەر ئەوە گەر لە هەر ڕاستییەك ئاگادار و دڵنیاش بوویت، لە هەموو جێیەك باسی مەکە.

هەر قسەیەکی ڕاستت بەرگوێ کەوت خێرا دنیای لێ تێمەگەیەنە.

هەر ڕاستییەکت زانی لە هەموو شوێنێك باسی مەکە.

دەبێت چاوەڕوانی کات و شوێنی گونجاو بکەیت و، لە جێی خۆیدا باسی بکەیت.

بەم جۆرە هەم قسەکانت جێی خۆی دەگرێت، هەم بێ هیچ کاردانەوەیەکی خراپ کارێکی باشتان ئەنجام داوە.

گەر وا نەبێت و بڵێیت: "وەڵا من لە ڕاستی لانادەم، جا هەرچییەك دەبێت با ببێت" ئەو کات چی دەرد و ئازار و نەهامەتییە بەسەرتدا دێت و، خۆت تووشی دەردەسەریی دنیا دەکەیت.

کەوابوو وەرن با ڕێك بکەوین لەسەر ئەوەی:

"وتەی ڕاست، ئەوەیە کە لە شوێن و کاتی خۆیدا بوترێت".[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیست و دووەم)ەوە وەرگیراوە.



# کەسی باش کێیە؟ ئەی کەسی خراپ کێیە؟

"واقیعی ژیان شایەتە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر بە کەسی خراپ بوترێت: "تۆ کەسێکی باش و بەرێزیت" ئەوا دوور نییە ئەم وتەیە هانی بدات بۆ ئەوەی ببێت بە کەسێکی باش.. هەروەها ئەگەر بە مرۆڤی باشیش بوترێت: "تۆ کەسێکی خراپیت" ئەوا لەوانەیە ئەم وتەیە بەرەو خراپە پاڵی پێوە بنێت".

– مەبەستت چیە؟ چۆن کەسی خراپ باش دەبێت و کەسی باشیش خراپ دەبێت؟

باشبوونی خراپەکار بە "تۆ باشیت! کەسێکی باشیت!" و، خراپبوونی چاکەکاریش بە "تۆ خراپیت! کەسێکی خراپیت!" شتێکی هێندەش دەگمەن و ئەستەم نییە.

کەسێك کە ڕووی خراپی زۆرە و، هەمیشە لە ناخیدا حەزدەکات خراپە لەگەڵ خەڵکیدا بکات و، هەر دەرفەتێکی بۆ ڕەخسا دەگەیەك دەوەشێنێت.

درۆ دەکات و، لە دژی خەڵکی قسە دەکات، بە کورتی: بە قسەکانی زیان بەخەڵك دەگەینێت.

هەمووتان کەسێکی لەم جۆرە لە شوێنێکەوە دەناسن، ئیتر یا لە قوتابخانەکەتاندایە، یا هاوپیشەتانە، یان دراوسێتانە، یان خزمتانە، یاخود بەشێوەیەك لە شێوەکان دەیناسن.

لە هەمان کاتدا دەزانن کە ئەم کەسە کەسێکی بەخشندە و دەستکراوەیە، واتە لەگەڵ ئەو هەموو لایەنە خراپەیدا ئەم خووە باشەی پاراستووە.

ئەم کەسە هاوڕێیەکی باشیشە، تەنانەت ئامادەیە بە هەموو توانایەوە کۆمەکیی هاوڕێکانی بکات و خاوەن قسەی خۆیەتی.

لەبەر ئەم هەموو لایەنە باشانەی کەسێتیی دەتانەوێت لەو چەند خووە ناشیرینەشی دوور بخەنەوە.

بۆیە گەر ڕۆژێك هات و بوویت بە هاوڕێی نزیکی و، لە ئەنجامدا یەکترتان خۆشویست و متمانەی ئەوت بەدەست هێنا. هەر کاتێك دەرفەتی قسەکردنت لەگەڵ ئەم کەسەدا بۆ هەڵکەوت، کە هەمووان بە خراپی دەزانن، پێت وت: "بەڕاستی تۆ کەسێکی باشیت، لەبەر ئەوەشە کە تۆم خۆشدەوێت".

یەکسەر هەڵیدایە و وتی: "ئەوە تۆ ئەڵێیت چی؟ من لە کوێ و چاکە و باشی لەکوێ! چیت لە من بینیوە وا بە باشم دەزانیت؟"

جارێکی تر لە کاتی قسەکردندا لایەنێکی باشی دیکەت وەبیر هێنایەوە و، وتت: "تۆ چەند بەخشندەیت! بەڕاستی حەزت لە هاوکاری کردنە!"، هەرچەندە یەکسەر دەڵێت: "أستغفر الله، ئەوە تۆ وای ئەبینیت"، بەڵام ئەم جارەیان هەست بە جوانییەکانی ناخی دەکات.

بە بیانووی هۆکارێکی دیکە، پێت وت: "تۆ زۆر دڵسۆز و سەرڕاستیت"، ئەو کات ئەویش دەڵێت: "إن شاء الله وا ئەبم، بەخوا من هەموو کەسێکم خۆشدەوێت".

پاشان گفتوگۆکانتان لەو بارەیەوە چڕتر کردەوە و، پێت وت:

"لەڕاستیدا تۆ زۆر کەسێکی باشیت، بەڵام خۆت باش ناناسیت، هەر لەبەر ئەوەی جارێك ناوت بە خراپە براوە، ئیتر دەستت لەخۆت شتووە. کەمێك ورە بەرە بەر خۆت، تا خووە ناشیرینەکانت بگۆڕیت، چونکە هەموو کەس وا دەزانێت تۆ تازە ئەم ڕێگەیەت گرتووە و لێی لانادەیت و، تا ماویت هەر بەم خووانەتەوە دەژیت".

بەم شێوەیە بە تێپەڕبوونی کات دەبینیت ئەم کەسە وردەوردە لایەنە باشەکانی دەردەکەون و لایەنە خراپەکانیشی کەم دەبنەوە و، کەسێکی ڕووخۆش و خۆشەویستی لێ دەردەچێت.

لە ڕاستیدا تۆ خۆت کارێکی وات بۆ نەکردووە و، شتێکیشت نەوتووە کە لەودا نەبووبێت.

کەمێك ڕووخۆشی، کەمێك دڵسۆزی، کەمێك دۆستایەتی بۆ کەسی بەرامبەرت بنوێنە، ئیتر بەچاوی خۆت دەبینیت کەسەکە لە کۆتاییدا بە چ حاڵێك دەگات.

کەواتە پێویستە لە ڕووە باشەکانەوە لە مرۆڤەکان نزیك بینەوە و، هەوڵ بدەین بێ بەڕووداداننەوە و شەرمەزار کردن لە ڕووە خراپەکانیشیان ئاگاداریان بکەینەوە.

* * *

ڕەنگە پێچەوانەی ئەو دۆخەش ڕووبدات، واتە کەسێك هەیە زۆر چاك و فریشتەئاسایە و، هەمووان بە ئاواتی چاکی و باشیی ئەوەوەن.. چاکە لەگەڵ هەمووکەس دەکات و، کەسێکی زۆر لەسەرخۆ و نەرمونیانە.

هەرگیز وتەی خراپت لێ نەبیستووە، نە لە ماڵ و نە لە سەرکار و، نە لە هیچ کوێ. چاوی نەبڕیوەتە ماڵی کەس و، کەسێکی شەرمن و بە ئابڕووە.

کەچی تەماشادەکەیت دەوروبەرەکەی نارەحەتی دەکەن و، ڕووبەڕوو قسەی هەڵەق و مەلەقی پێ دەڵێن و، کار و تاوانێکی دەدەنەپاڵ کە ئەم بەستەزمانە هەر سەرییشی لێ دەرناکات و پێی دەڵێن:

"تۆ خۆت هەردیارە کەسێکی دووڕوویت و لەبەرچاو خەڵك خۆت باش دەرەخەیت".

"تۆ و چاکەکردن کوجامەرحەبا، ئەوەی خراپەیە لە تۆ دەوەشێتەوە".

"تۆ بۆ هەموو شتێ سەرشۆڕ دەکەیت و، چاکەی کەست ناوێت خۆت نەبێت".

"ئەرێ ئەو ڕۆژە تۆ نەبوویت واو وات کرد؟"

"چاوت بە خۆشی کەس هەڵ نایەت، حەز ئەکەیت هەموو شتێك بەس هی تۆ بێت و، کەس نینۆکی نەبێت سەری خۆی پێ بخورێنێت"...

قسەوقسەڵۆکی زۆری دیکەی وەکو ئەمانە و لەمانەش ژەهراویتر بەگوێی ئەو کەسە بەستەزمانەدا دەدرێت.

هەر بۆیە ئەو داماوەش ئیتر ورەی دەڕوخێت و، متمانەی بەخۆی نامێنێت و، لە ناخەوە دادەڕمێت و، سەری خۆی کز دەکات و حەز بە بینینی کەس ناکات و قسەش لەگەڵ کەس ناکات.

گەر دە ساڵ لەوەوپێش هەر گوناهێکی بچووکی کردبێت، ئێستە دێتەوە پێش چاوی و نەفس و شەیتانیش هێندەی دیکە مێشکی ئاڵۆز دەکەن و، قوڕەکەی بۆ خەست دەکەنەوە.

ڕۆژگار هات و ڕۆیشت و تێپەڕی و ئەم کەسە فریشتە ئاسایە بووە نێچیرێکی باڵشکاوی چنگی شەیتان و، هیچ کام لە تایبەتمەندییە جوانەکانی پێشووی نەما.

کەواتە ئەوەی مرۆڤ باش دەکات و خراپیشی دەکات، دەوروبەر و ئەو ژینگەیەیە کە تێیدا دەژی.

* * *

ڕەنگە مرۆڤ بە بیستنی دووبارە و سێبارەی خراپە و ڕستەی (تۆ خراپیت)، لە چاکە دووربکەوێتەوە. هەروەها گەر لەگەڵ کەسانی خراپدا مامەڵە بکات، ئیتر خووی ئەوان دەگرێت، چونکە پێشینان وتوویانە: "دوو گا لە دۆڵێکدا بن، ڕەنگی یەك نەگرن خووی یەك دەگرن".

ئەگەر لەگەڵ کەسانی تەمبەڵ و، شکستخواردوو و، ڕەشبین و، کەم ئەزموون و، زۆربلێدا هەڵسوکەوت بکەیت، ئیتر ئەگەر هیچ کام لەو سیفەتانەشت تێدا نەبێت، لە ئاکامدا باری دەروونی خۆشت بەهۆی ئەو کەسانەوە هەر دەشێوێت..

چونکە هەستان و دانیشتن و هاودەمیکردنی کەسانی بێ هیوا و دڵڕەق و ڕەشبین و بیرتەسك، ژیانی مرۆڤ لەبن دەهێنێت.

خۆ ئەگەر هاودەمیی کەسێکی ڕووخۆش و زمانشیرین و لێوبەخەندەی وا بکەیت کە هەر بەدیتنی خەمەکانت دەڕەوێتەوە و،

بچێتە هەر کوێ دەیکاتە جەژن و خۆشی و، خەندە بە دەوروبەرەکەی دەبەخشێت، ئەوا پاش ماوەیەك بزانە ژیانت چۆن لەناکاو لا ئاسان و سانا و پڕ هیوا دەبێت!

ئینشائەڵڵا لەو کەسانە بین کە زمانشیرین و ڕووخۆشن و، دڵی دەوروبەرەکەیان خۆش دەکەن و، خەندە دەخەنە سەر لێویان...[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیست و دووەم)ەوە وەرگیراوە.

# ترس چییه؟ ئێمه بۆچی دەترسین؟



" خوای گەورە هەستی (ترس)ی پێ بەخشیوین تا ژیانی
پێ بپارێزین، نەك بۆ ئەوەی بیکەین بە هۆکارێك بۆ
لەناوبردنی ژیانەکەمان".

دەگونجێت بترسین لەوەی بەشەودا بچین بۆ مەتبەخ، یاخود بۆ حەمام، تەنانەت ڕەنگە لە چوونە ناو ژووری خۆشمان بترسین.

– بۆچی دەترسین؟

– چونکە تاریکە، ڕۆشنایی تێدا نییە، ڕووناك نییە.

– لەو شوێنە چی لێیە وا ئاوا لێی دەترسین؟

– هیچی لێ نییە ! خۆشت کە دەچیت، گلۆپەکان هەڵدەکەیت، دەبینیت هیچی لێ نییە.

– دەبێت کێی لێبێت؟ نەناسراوێك؟

- نەخێر، هەرگیز ! چۆن شتی وا دەبێت! لە کوێوە ڕۆیشتە ئەوێ! هەر کە ژوورەکە ڕووناك بووەوە دەزانیت کە کەسی لێ نییە.

- کەوابوو بۆچی دەترسین؟ لەچی دەترسین؟ بۆچی لە تەمەنی سێ چوار ساڵیدا لە هیچ نەترساوین، کەچی ئیستە لە ناخماندا ترس سەری هەڵداوە؟

- دەشێت لە ڕێی پەرتووکێکی ترسناکەوە بوو‌بێت کە خوێندوومانەتەوە، یاخود فیلمێك یان هەر شتێکی دیکە.

گەر تەماشای فیلمێکی ترسناکت کردبێت.. ئەوا لەگەڵ بینینی هەر شوێنێکی تاریکدا ڕاستەوخۆ ڕووداوەکانی ناو ئەو فیلمەت بیر دێتەوە.

یان جاری وا هەیە شتێکت لە هاوڕێکەتەوە یان لە خزمێکتانەوە بیستووە و، بەو هۆیەوە ترسێکی زۆر ناخی تەنیویت.

هەندێ کەس لە سواربوونی فڕۆکە دەترسێت، هەندێك لە کەشتی و بەلەم...

- لە چ شتێکی ئەمانە دەترسێت؟

- لەوەی فڕۆکەکە بکەوێتەخوار! یا بەلەمەکە نوقم ببێت...

- باشە لە ڕۆژێکدا چەند فڕۆکە ئەکەوێتە خوار؟ یان چەند بەلەم نوقم دەبێت؟



باپیرە نوور ڕووداوێکمان لەم بارەیەوە بۆ دەگێڕێتەوە کە بەسەر خۆیدا هاتووە:

"زەمانێك زانایەکی مەزنی هاوڕێم (خوا لێی خۆش بێت) لە سواربوونی بەلەم دەترسا..

دەمەو ئێوارەی ڕۆژێك لەگەڵ ئەودا بەرەو لای پردەکەی ئەستەنبوڵ هاتین و، دەبوو سواری بەلەمێك ببین، چونکە ناچار بووین بچین بۆ مزگەوتی (ئەبو ئەییوبی ئەنصاری) و، ئەوەش تاکە ڕێگە بوو و، ڕێی وشکانی یا ئۆتۆمبێلی لەسەر نەبوو، بۆیە منیش زۆرم لێکرد بۆ ئەوەی سواری بەلەم ببین، چونکە ڕێگەچارەی ترمان لەبەردەستدا نییە.

وتی: – دەترسم، ڕەنگە بەلەمەکە نوقم بێت و، بخنکێین!

پێم وت: – ژمارەی بەلەمەکانی ئەم کەنداوە بە چەند بەلەم مەزەندە دەکەیت؟

وتی: – لەوانەیە هەزار بەلەمێك بن.

وتم: – باشە لە ساڵێکدا چەند بەلەم نوقمی ئاو دەبن؟

وتی: – یەك یان دووانێك، لەوانەشە لە چەند ساڵێکدا هیچیان ژێر ئاو نەکەوێت.

وتم: – ساڵێك چەند ڕۆژە؟

وتی: – سێ سەد و شەست و پێنج ڕۆژێکە.

وتم: – ئەو گریمانەیەی کە لە ناخی تۆدا جێگیر بووە و دەتترسێنێت، یەك ئەگەرە لە سێ سەد و شەست و پێنج هەزار گریمان. جا ئەو کەسەی لە ئەگەر و گریمانێکی وا بترسێ نە بە مرۆڤ دادەنرێت و نە ئاژەڵ!

پێم وت: – باشە تۆ بە مەزندەی خۆت چەند ساڵی دیکە دەژییت؟

وتی: – من پیرێکی بەتەمەنم، ڕەنگە هەر تەنها دە ساڵی تر بژیم.

وتم: – بەوپێیە ئەجەل نادیارە و کەس نازانێت کەی دەمرێت، ڕەنگە هەر ڕۆژێك بێت بمریت، کەواتە لە سێ سەد و شەست و پێنج ڕۆژی ساڵێکدا هەموو ڕۆژێك ئەگەری مردنت هەیە. کەوابوو گریمانی مردن وەك هی ژێرئاوکەوتنی بەلەمەکە نییە، کە گریمانێکە لە نێوان سێ سەد هەزار گریماندا، بەڵکو گریمانێکە لە نێوان سێ هەزاردا و لەوانەیە هەر ئەمڕۆ ئەو گریمانەش ڕووبدات! کەواتە ئەبێ ترست لێ

بنیشێت و دەست بە گریان بکەیت و هەر لە ئێستاوە وەسیەتەکەشت بنووسیت!

ئەم قسەیەم کاری تێکرد و هۆشی بەخۆی هاتەوە و، بە لەرزێکەوە سوار بەلەمەکە بوو، لەناو بەلەمەکەدا پێم وت:

خوای گەورە بۆیە هەستی (ترس)ی پێ بەخشیوین تا ژیانی پێ بپارێزین، نەك بۆ ئەوەی بیکەین بە هۆکارێك بۆ لەناوبردنی ژیانەکەمان، واتە (ترس)مان بۆ خۆناڕەحەتکردن و بارگرانکردن و ئازاردان پێ نەبەخشراوە.

ترس لە ئەگەرێك لەناو سێ چوار ئەگەردا، تەنانەت لەناو پێنج شەش ئەگەریشدا هەر ئاساییە، بەڵام ترس لە ئەگەرێك لە ناو سی چل ئەگەردا بە ترس دانانرێت، بەڵکو وەهم و وەسوەسەیەکە بەسەر مرۆڤدا زاڵ بووە و ژیانی لێ دەکات بە ئەشکەنجە و دەردی سەری.

* * *

مرۆڤی ترسنۆك هەرگیز سەرکەتوو نابێت، ئەوەتا بە کەسی ترسنۆك دەڵێن: "لە سێبەری خۆشی دەترسێت!" .

– بۆ.. مرۆڤ هەیە لە سێبەری خۆی بترسێت؟

– بەڵێ، هەیە.

ئەو کەسانەی کە لە شتی خەیاڵی و وەسوەسە دەترسن، ئەوا لە بری ترسان لە شتێك کە شیاوی ترس بێت، هەردەم دواکەوتوو دەبن.

- کەواتە لەچی بترسین؟

- لەو شتانەی کە ئەگەری زیان و مەترسییان زۆرە.

لەو کەسانەی کە دەتوانن زیان بە خۆمان وماڵ و ئابڕوو و ناموسمان بگەیەنن.

لەو شوێنانەی کە زیان بە بەها ئایینی و ئیمانی و ئەخلاقییەکانمان دەگەیەنن.

هەروەها لەو کەسانەش کە لە خودا ناترسن، وتراویشە: "لەو کەسە بترسە کە لەخوا ناترسێت".

کەوابوو پێویستە هەستی ترس لە کات و شوێنی خۆیدا بەکار بهێنرێت.

گەرنا، ئەم هەستە، کە خودا بۆ پارێزگاری لە ژیانمان پێی بەخشیوین، تەمەنمان لێ دەکاتە ژەهر و دنیامان لێ دەکاتە چەرمە چۆلەکە.[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیست و نۆیەم)ەوە وەرگیراوە.



# کاتێک تاوان دەکەین ئیمانمان نامێنێت؟

"تاوان کار لە دڵ دەکات و لەکە و تاریکاییەکانی خۆی بەناویدا بڵاو دەکاتەوە و، هێندە دڵ ڕەق دەکات، کە نووری ئیمانی لێ دەردەکات.. هەموو تاوانێکیش ڕێگایەکی بەرەو کافربوون لێ دەبێتەوە".

تاوان، ئەو کارە خراپەیە، کە خودا لێمانی قەدەغە کردووە.

تاوان، ئەو بارودۆخەیە کە ئێمە لە خۆشەویستی خودا دوور دەخاتەوە.

تاوان، ئەو دڕکەیە کە شەیتان لەسەر ڕێگای بەهەشت دایناوە.

تاوان، ئەو ڕێگەیەیە کە ئێمە لە پەرستشەکان سارد دەکاتەوە و، بەرەو سەرپێچیکردنمان دەبات.

تاوان، ئەو خوو و ڕەوشتەیە کە ئێمە دەداتە دەست شەیتان، تا جڵەوگیرمان بکات.

تاوان، واتە هاوکاری کردنی شەیتان و، هەڵسوڕان بە وەسوەسە و فەرمانەکانی.

تاوان، ئەو کارە فریودەرەیە کە بیروهزرمان بێزار دەکات و، ڕۆحمان ئازار دەدات و، ئیرادەمان دەداتە دەستی نەفسمان.

تاوان، ئەو گێژاوەیە کە ئێمە لە خۆشەویستی و ڕێز و سۆز و میهرەبانییەوە بەرەو بێزڕێزی و ڕقلێبوونەوە دەبات و هەستەکانمان چەواشە دەکات.

تاوان هەنگوینێکی ژەهراوییە؛ سەرەتا شیرینە، بەڵام دواتر کز و گرمۆڵەت دەکات و، ئێش و ئازارت پێدەدات و، ناخت تێك دەدات.

تاوان پەشۆکاوی و نەهامەتی و، کەندەلانێکی فانییە.

تاوان، گەوجی و، بەهەندوەرنەگرتن و، سنوورشکێنییە و، قایل بوونە بە هاوکاریکردنی شەیتان.

تاوان ڕق لێبوونەوە لە ڕاستی و، بەگژداچوونەوەی حەقە و، هەڵسوکەوتکردنە بە ویست و ئارەزووی نەفست و، ئەڵقەلەگوێبوونی کەیف و ئارەزووەکانتە.

***

خراپترین ڕووی تاوان ئەوەیە کە دڵ ڕەشدەکاتەوە.

ڕۆژگاری دەکاتە شەوەزەنگ و، ڕۆشناییشی دەکاتە تاریکستان.

تاوان، نووری دڵ ناهێڵێت و، ڕووناکییەکەی دەکوژێنێتەوە و، گەشی و درەوشاوەیی ناهێڵێت و بریقەی لێ دەبڕێت و، ژەنگاوی دەکات و، بەتەمومژ دایدەپۆشێت.

ئەما جاری وا هەیە، کاتێك وزەی کارەبای ماڵەکەتان کز دەبێت، گڵۆپەکان بە کزی هەڵدەبن و ڕوناکییان کەم دەبێتەوە.. دەی گوناهیش هەر وایە. دڵ بە ئیمان ڕووناك دەبێتەوە و، بە ئیمان نوورانی دەبێت، واتە وزەی خۆی لە ئیمانەوە وەردەگرێت.

گوناهیش نووری ئیمان لاواز دەکات و، کەمی دەکاتەوە و، شەوق و زەوق و کاریگەریی ناهێڵێت، تا وای لێدێت دڵ، بەتەواوی تاریك دادێت و، ئیمانیش فڕێدەداتە دەرەوە.

لە کۆتاییدا -خوا پەنامان بات- مرۆڤ پێی هەڵدەخلیسکێتە چاڵی پشت ئیمان و، لە بیری کوفردا نوقم دەبێت و، لە زۆنگاوی بێباوەڕیدا دەچەقێت.

* * *

- چۆن مرۆڤ دەگاتە ئەم حاڵە؟ چۆن شتی وا دەبێت؟

- کەسێك بهێنە پێش چاوی خۆت کە لە نوێژەکانیدا ساردوسڕە و تەمبەڵی دەکات.

بەیانیان دەڵێت خەبەرم نابێتەوە و نوێژی بەیانی ناکات، شەوانیش دەڵێت خەو دایگرتووم و نوێژی خەوتنانیش ناکات، لەملاشەوە ئیشوکاری زۆرن و فریای نوێژی نیوەڕۆ و عەسر ناکەوێت.

ئەمە ڕۆژێك، دووان، سیان.. ئیتر وای لێ دێت کە نوێژی بەلاوە گران دەبێت و، لێی بێزار و وەڕس دەبێت.

هەموو جارێك كە گوێبیستی بانگ دەبین، واتە كاتی نوێژێك بەسەرچوو و، ئیتر كاتی نوێژێكی دیكەیە.

خوای گەورە هەموو ڕۆژێك و هەموو فەرزێك ئەمەمان بیردەهێنێتەوە.



كەچی ئەم كەسە هەندێك جار تەنانەت گوێش بۆ بانگەكە ناگرێت.

هەندێك جاریش دەڵێت: "كورە خۆ هێشتا كاتی ماوە و، جارێ نایكەم".

تەنانەت كار بەوە دەگات كە ئەو كەسە دەڵێت: "ئەرێ فەرزێك نییە، دووان نییە، تا ماوین ئەبێت خەریكی نوێژكردن بین، خۆ هەر تەواو نابێت!" .

بەم جۆرە ئیتر گوێ بۆ فەرمانی خوا ڕانادێرێت و، هیچ باكی پێوەیان نابێت، ئاخر هەر كە بەم شێوەیە پەتی تەزبیحی باوەڕی پچڕاند ئیتر بە تەواوی واز لە نوێژ دەهێنێت؛ بەڵام ناڕەحەتی نوێژنەكردنی هەر لەسەر دڵ لاناچێت و، بەردەوام دڵتەنگی دەكات.

بەڵام ئا لەم كەینوبەینەی نەفسدا ئیتر شەیتان دێتە كایەوە و وەسوەسەی بۆ دەكات و دەڵێت:

"کوڕێ نوێژ نوێژی چیته ! بیکەیت چی دەبێت و نەیکەیت چی دەبێت؟ خۆ ئەو کەسەش کە نایکات هیچی لێنەهاتووە".

کار هەر بەوەشەوە ناوەستێت، بەڵکو زۆر نابات و پاش ماوەیەك ئەم کەسە سەرلێشێواوە گومان لە بوون و یەکتایی خوای گەورەش دەکات، واتە ئیمان و باوەڕی دەکەوێتە مەترسییەوە و، ئەو تۆوی کوفرەی شەیتان لە دڵیدا چاندوویەتی وردەوردە گەشە دەکات.. ئەم داماوەش هەنگاو بە هەنگاو لە دەرگایەکی مەترسیدارەوە دەچێتە ژوور.

* * *

بۆ نموونە:

کەسێك تاوانێکی شەرمەزارکەر دەکات، بەڵام حەز ناکات کەس لەم دۆخەیدا بیبینێت و هەوڵ دەدات دوور لە چاوی هەموو کەس ئەو گوناهەی بکات.

باشە با دوور لە چاوی مرۆڤەکان ئەم گوناهەی کردبێت، خۆ بوونەوەری دیکە هەیە کە ئەو لەو حاڵەیدا دەبینن.

بۆ نموونە فریشتەکان دەیبینن، چونکە فریشتەی بەرپرس هەیە لە تۆمارکردنی کار و کردەوەی مرۆڤەکان.

ئەو کەسەی کە لەم بارەدایە، کاتێك کە بیری هەبوونی فریشتەکانی دەکەوێتەوە، ناڕەحەت دەبێت لەوەی فریشتەکان ئەویان

بینیوه، بۆیه نائارام دەبێت و، به خەیاڵی ئاسوودەوە گوناهەکەی ناکات، واته چێژ له گوناهەکەی نابینێت.

بۆ ئەوەی له داهاتوودا بێباکانه بەگوێی نەفس و ئارەزووەکانی بکات، وردەوردە بەرەو نکوڵیکردن له هەبوونی فریشتەکان دەچێت.

له ئەنجامدا یەکێك له پایه سەرەکییەکانی ئیمان لەدەست دەدات که بریتیه له (باوەڕبوون به فریشتەکان).

بەکورتی، ئیمانی لاواز دەبێت و دوای ماوەیەك ئیتر کەسێتی و بوونی خۆی ون دەکات و، ڕۆژگارێك بەسەر دەبات که بەتەواوەتی ئیمانی له دڵی داماڵیوە.

پێشینانیش وتویانه: "له گەستنی مێشوولەیەك ڕا دەکات و، خۆی دەداته بەردەم گازەکانی مار!"[1].

---

١- له (بریسکەی دووەم)ەوە وەرگیراوە.

# پەرستشی ئەرێنی چیە؟



"پەرستش دوو بەشە: بەشێکی ئەرێنی (ئیجابی)یە و، بەشەکەی تری ئەرێنی (سەلبی)یە.

بەشە ئەرێنییەکەیان زانراوە، بەشە نەرێنییەکەشیان ئەوەیە کە تۆ لە کاتی نەخۆشی و نارەحەتییەکاندا هەست بە لاوازی و کەمدەستەڵاتی خۆت بکەیت و، بە تەوەککولەوە ڕوو لە خوای پەروەردگاری بەسۆز بکەیت و، لێی بپاڕێیتەوە و بە پاك و بێگەردی بیپەرستیت".

پەرستش دوو جۆرە:

– یەکێکیان ئەرێنییە.

ئەرێنی واتە: (باش، چاك، ئاسایی).

ئەمە ئەو پەرستنەیە کە هەموومان دەیزانین و هەوڵ دەدەین بیکەین، وەك: نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و چاکەکردن لەگەڵ دایك

و بـــاوك و دەوروبـــەر و قورئانخوێنـــدن و ســـڵاوات دان لەســـەر پێغەمبەرﷺ.

– جۆرێکی دیکەی پەرستش نەرێنییە.

نەرێنی واتە: (شتێك کە باش نەبێت، حەزلێکراو نەبێت، بـەدڵمان نەبێت، ئاسایی نەبێت).

– بەڵام کە دەڵێین پەرستش نابێت شتی ناخۆش و خراپـی تێـدا بێت، ئەی نەدەبوو شتی ئەرێنی و جوانی تێدابووایە؟

– لە ڕاستیدا (پـەرستشی نەرێنی)یش هـەر واتـە پـەرستش، نـەك شتێکی خراپ و ناخۆش.

وەرن با هەوڵ بدەین بەم جۆرە لە پەرستشی نەرێنی تێبگەین:

مەرج نییە ئێمەی مـرۆڤ هـەموو شـتێك بـە ویسـتی خۆمـان بێـت. هـــەروەك چـــۆن ڕۆژە خۆشـــەکان لـــە بەرژەوەنـــدیی ئێمـــەدان، ڕۆژە ناخۆشەکانیش هەر لەبەر ئێمەن...

هەندێك جار پێدەکەنین و هەندێك جاریش دەگرین...

زۆر کات کاروبارەکانمان زۆر بەڕێکوپێکی بەڕێوەدەچن و، هەموو شتێك وەها دەبێت کە دەمانەوێت و، هەندێك جاریش بـە پێچـەوانەوە دەبێت.

ڕۆژێك دێت نەخۆش دەکەوین، یا بەڵایـەکمان بەسـەردا دێـت، یـا تووشی ڕووداوێك دەبین، یا کەسێکی نزیکمان شتێکی بەسەر دێت، یـا

خۆشەویستێکمان لەدەست دەدەین، بەکورتی پێشهاتێکی ناخۆشمان دێتەڕێ و، بێتاقەت دەبین، خەندە لە لێوانمان دەتۆرێت، دنیامان لەبەرچاو دەبێتە چاڵێکی تەسك و تار.

ئیتر دەست دەکەین بە سکاڵا دەربڕین و شیوەن و ناڵاندن و، دەڵێین:

"ئەی ئەم بەڵایە لە کوێوە هات؟ ئەڵێی چی بەڵای دنیا هەیە ڕووی لە من کردووە؟"

* * *

زۆرجار مرۆڤ لە حیکمەتی کارەکان تێنەگەیشتووە و، تەنها تەماشای ڕووی دەرەوەی ڕووداوەکان دەکات، هەر بە بیریشیدا نایەت بزانێت دیوی ناوەوەی ئەم ڕووداوانە چۆنییە.



پەروەردگار دەیەوێت بەم پێشهاتانەی ئێمە حەزمان لێیان نییە، ئێمە لە خۆی نزیك بکاتەوە و بۆلای خۆیمان ڕابکێشێت.

خوای گەورە و میهرەبان هەرگیز ئێمە بە دەردی خۆمانەوە جێ ناهێناڵێت.. ڕۆژگارێك دێتەپێشەوە کە نەخۆش دەکەوین و ئازارەکانمان زیاد دەکەن، لە هێز و توانا و بازوو دەکەوین و، سەرمان قوس دەبێت و،

هیچ دەرمانێك دادمان نادات. هەرچەندە گەنج و لاویش بین، بەڵام ناتوانین سەرمان لەسەر سەرینەکەمان بەرز بکەینەوە.

بەم جۆرە تێدەگەین کە بوونەوەرێکی چەندە لاوازین و هیچ پشتوپەنایەك شك نابەین و، تەنها چارەمان ڕووکردنە قاپی خوای گەورەیە.. بۆیە دەردەڵی خۆمان بۆ خوای گەورە هەڵدەڕێژین و، داوای یارمەتی لیٚ دەکەین و، بە تەوەککولەوە لێی دەپاڕێینەوە.

چاوەڕوانی شیفا لە زاتی موبارەکییەوە دەکەین، چونکە تەنها ئەو سارێژکاری دەردمانە.. چونکە ئێمە بیٚ دەستەڵاتین و، ئەویش بە توانا و کاربەجێیە.

ئێمە نەدارین و، تەنها زاتی موبارەکی ئەو هەموو پێداویستییەکانمان دابین دەکات.

با دەنگیشمان لەرزۆك و نوساو بێت، بەڵام ئەو هەر گوێی لە دەنگمانە و، وەڵامی نزاکانمان دەداتەوە.

دەردەکانمان زۆر زۆرن، بەڵام هەمیشە ئەو بە هانامانەوە دێت.

هەرچەندە دڵشکاو و غەمبار بین، ئەو خۆشبەختی و ئاسودەییمان پیٚ دەبەخشێت.

کاتێك بەدەست نەخۆشی و بەڵاوە دەتلێینەوە، یەکسەر خوای گەورەمان دێتەوە یاد و، خۆمان دەهاوینە ئامێزی ڕەحمەتی زاتی موبارەکییەوە.

هەر بۆیە ئەو نزایانەی مرۆڤ لە ناڕەحەتیدا دەیانکات، پاك و بێ گەرد و دڵسۆزانەن و، دوورن لە ڕووپامایی و ڕیابازی.

بەم جۆرە، هەموو ئەو حاڵە نەرێیانانەی کە خراپ و نەخوازراو دەردەکەون، هەر یەکەیان دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی زمانمان ئەرکی ڕاستەقینەی خۆی بەجێ بهێنێت و بکەوێتە نزا و پاڕانەوە.

* * *

وەك ناوی خۆمان دەزانین کە ئەگەر خوا ویستی لەسەر نەبێت، هیچ کەس ناتوانێت ئازارێکمان بدات.

هەر دەرد و بەڵا و موسیبەتێکیش ئێزنی لەوەوە وەرگرتووە، پاشان ئێمەی بەخۆیەوە گرفتار کردووە.

کەواتە مادام ئەو دەرد و بەڵایاناش لەلایەن خوای گەورەوە هاتوون، ئەوا پێویستە بڵێین: "بەخێر هاتیت!".

ئا بەمەش جۆرە پەرستشێکی نەرێنیمان ئەنجامداوە.

واتە کاتێك لەدەست نەخۆشی و دەرد و مەینەتی سكاڵا دەرنابڕین، ناخمان ئاسوودە دەبێت.

مادەم ئەم ئازار و نەخۆشیانە لەلایەن خوداوە هاتوون، کەواتە پێویستە بە پشوودرێژی و ئارامگرییەوە ڕووبەڕوویان ببینەوە، تا بەری ئارامگرییەکەشمان بنۆشین.

له ڕاستیدا هەرچەندە ئارامگرتن ناخۆش و تاڵە، بەڵام ئەنجام و بەرەکەی شیرینە.

لەهەمان کاتدا پێویستە ئارامگرتنیش لە کات و شوێنی گونجاوی خۆیدا بێت، بۆ نموونە ساتەوەختی سەرەتای هەست بە نەخۆشی کردن، یا لەگەڵ ڕووداوێکدا ...

بەم شێوەیە، پاش چەشتنی ئەم ئازارانە پەرستشێکی دیکەشمان ئەنجام داوە، ئەویش ئارامگرتنە...

* * *

نەخۆشی و ئازارەکان جۆرە ئاگادارکردنەوەیەکن لەلایەن خوداوە، یادخستنەوەیەکی خوداین، واتە هەم خودامان بیردەخەنەوە، هەم لە هەندێك گوناهیش پاکمان دەکەنەوە؛ چونکە بەشێکی بەڵاکانمان دەرەنجامی هەندێك تاوانن کە پێشتر ئەنجاممان داون.

ئەگەر لەسەر ئازارەکان ئارامگر بین، ئەوا ئەم هەڵوێستەمان دەبێتە مایەی لێخۆشبوونی خوای گەورە لە تاوانەکانمان، واتە هەروەك چۆن گەڵا زەردەکان دانەدانە هەڵدەوەرێن، بەو جۆرەش نەخۆشییەکان گوناهەکانمان هەڵ دەوەرێنن و، لە ئەنجامدا لە گەردوباری تاوانەکان پاك دەبینەوە.

بڕوانن، پەرستشە نەریتییەکان ئێمە بەکوێ دەگەیەنن و، چیمان دەست دەخەن!

کاتێك کە نووری ئیمان ژیانی بۆ ڕۆشن کردینەوە، هەر یەك لە ڕۆژە خۆشـەکان و ڕۆژە ناخۆشـەکان و ڕۆژە ئارامـەکان و ڕۆژە پڕکێشەکان، بە پەرستش و بەندایەتی بەڕێ دەکەین.[1]

---

١- لە (بریسکەی دووەم)ەوە وەرگێراوە.



# بەڵا و ناخۆشییەکان چۆن کەم دەکەن؟

"ئەگەر بەڵا و موسیبەتە مادییەکان بە گەورە بزانین ئەوا گەورە و گەورەتر دەبن، گەر بە بچووکیشیان بزانین بچووك دەبنەوە، بەڵای هەرەگەورە و دژوار و زیانبەخش ئەو بەڵایەیە کە ڕوو لە ئاینمان دەکات".

بەڵا دوو جۆرە:

(یەکێکیان دنیایی و مادییە، ئەوی دیکەیان مەعنەویی و ئایینیە).

هەمووسان دەزانین بەڵا دنیایی و مادییەکان چین، وەك:

نەخۆشی و دەرد و ئازارەکان و، ئەو زیانانەی کە بەر گیان و ماڵمان دەکەون و، ئەو ڕووداوانەی کە دەبنە هۆی لەدەستدانی گیان و ماڵمان.

ئاگرکەوتنەوە، کارەساتە سروشتییە جۆراوجۆرەکان: بوومەلەرزە، لافاو، پەتا و دەردی کوشندە... قات و قڕی و، وشکە

سالّی.. ئەمە سەرەڕای جەنگ و هەر شتێکی دیکە کە بەهۆی مرۆڤەکانەوە دێتە کایەوە و، مرۆڤایەتی پەرێشان دەکات.

ئێمەی مرۆڤ بەردەوام بەم بەڵایانە دەورمان تەنراوە و، هەمیشە ڕووبەڕوومان دەبنەوە، جا ئیتر بەڵاکە بەسەر خۆمان یان کەسێکی نزیکماندا بێت.

جاری وا هەیە بەدەست کێشەیەکەوە دەڵێین: "ئاه! ئەوە چی بوو؟"، بەڵام زۆر بۆی داناچین و، لەبیرمان دەچێتەوە.

جاری واش هەیە، بۆ چەند ڕۆژێك لەژێر کاریگەرییدا دەمێنینەوە.

هەروەها جاریش هەیە تووشی ڕووداوێك دەبین و، چەندین مانگ بە ئازارەکانییەوە دەناڵێنین، تەنانەت ڕەنگە خۆمان بۆ نەگیرێت و دەست بکەین بە گریان.

دەبێت لە ئاست ئەم هەموو بەڵایەدا چی بکەین و، چۆن هەڵسوکەوت بکەین؟ چۆن لێیان بڕوانین؟ چ ڕێ و شوێنێك لە میانەیاندا بگرینەبەر؟

* * *

سەرەتا پێش هەموو شتێك: نابێت بەڵاکان لە بەرچاومان زەق و گەورە بکەین، بەڵکو دەبێت بە بچووك و سادەوساکار لێیان بڕوانین.

نابێت لەناو ئازارەکاندا نوقم ببین و بەچۆکدا بێین و پاڵی لێ بدەینەوە، بەڵکو پێویستە بەدووی ڕێگەچارەیەکدا بگەڕێین، کورتترین ڕێگەش ئەوەیە موسیبەتەکان بە کەم تەماشا بکەین.

- چۆن؟

- ئەها هەندێك جار لە تاریکیدا خەیاڵێك بەرچاوی مرۆڤ دەگرێت.

هێندە چاو لە پەتێك دەبڕێت کە لە سووچێکدا دەلەرێتەوە، تا ئەو پەتەی لێ دەبێت بە مار و، ئیتر خۆی خۆی دەترسێنێت.

یاخود لە باخچەیەکدا دانیشتووە و لە دەوروبەری دەڕوانێت و، لەناکاو بایەك دارەکە دەلەرێنێتەوە، ئیتر ئەو وا دەزانێت دارەکە بووەتە گیانەوەرێکی ترسناك و، هاکا پەلاماری ئەمی دا!

ئەمە لە کاتێکدا نە پەتەکە مارە و نە دارەکەش گیانداریكی ترسناك، بەڵکو تەنها شتەکانی لەبەرچاوی خۆی گەورە کردووە و، لە هیچی خۆڕایی ترس و لەرزی لەخۆی هێناوە.

خۆ ئەگەر یەك تۆز بوێر بوایە و، بچوایە ئەو پەتەی بەدەست بگرتایە، یا بڕۆشتایە و لە نزیکەوە تەماشایەکی دارەکەی بکردایە، ئەوا نە ترسی لە دڵدا دەما و نە هیچ...

ئەو بەڵایانەش کە بەسەرمانا دێن هەر وەك ئەمەن، واتە گەر لەبەرچاو گەورە بکرێن، ئەوانیش گەورە دەبن و داهاتوو تاریك دەکەن

و هیواکانمان لەناو دەبەن و، بە خەم و پەژارە ژیانمان بەرەو هەڵدێر دەبەن.

بەڵام بزانە: بەڵاکان هەرچییەك و هەرچۆنێك بن، خۆ هەر تەواو دەبن.

هەمیشە ئازاری یەکەم ڕۆژ و یەکەم ساتیان نابێت، بەڵکو ڕۆژ بەڕۆژ کەم دەکات.

لەبەر ئەمە دەبێت هەوڵ بدەین هەر بەڵایەکمان بەسەردا هات بە سووك و سادەیی بیگرین و، بە دەروونێکی دڵنیاوە مامەڵەی لەئاستدا بکەین و، بەتەواوی ژیانمان نەخەینە ژێر کاریگەرییەوە.

گەورەترین هۆکار بۆ ئەوەی ئازارەکانمان لەسەر زیاد بکات، ئەوەیە کە بەردەوام مەراقیان لێ بخۆین.



ئەگەر هەر بڵێین: "تۆ بڵێی چاك ببمەوە؟ باشە خراپتر نابم؟ ئادەی بزانم چەند کەس بەم دەردەی من مردووە" و مەراقی لێ بخۆین، بەم شێوەیە تا دێت خراپتر دەبین و، ئەمجارە ئیتر نەخۆشییەکەت لە ئازارێکی مادیی و جەستەییەوە دەبێتە ئازارێکی مەعنەوی و، لەناو دڵدا ڕەگ دادەکوتێت و، باری دەروونی مرۆڤ بە تەواوی تێك دەدات.

بۆ ئەوەی گرفتاری حاڵێکی دەروونیی وا خراپ نەبین، پێویستە هەرچییەکمان بەسەردا هات، بەشتێکی جوان و باشی ببینین و، بەوە ڕازی بین کە لەلایەن خوداوە بۆمان هاتووە و، بە تەواوی پشت بە خودا ببەستین و، خۆمان تەسلیمی میهرەبانی و دانایی ئەو زاتە بکەین.

بەم جۆرە مەراقت نامێنێت و ئازارەکانیشت لەسەر لادەچن و، لە ئەنجامدا کێشەکە لە ڕەگ و ڕیشەوە چارەسەر دەبێت.

ئەم بابەتە وەك بڕینی ڕەگی درەخت وایە، واتە هەروەك چۆن گەر ڕەگی درەختێك ببڕیت ئەوا تەواوی درەختەکە وشك دەبێت، کێشە مادییەکانیش گەر بە سادە وەریانبگرین وشك دەبن و نامێنن.

* * *

نموونەیەکی دیکە:

ئەوانەی بە ژینی لادێ ئاشنان ئەم باسە باش دەزانن.. کاتێك لە شوێنێك بیت کە هەنگی کێوی لێ بێت، ئەوا هەنگەکانی تاکە تاکە هێرشت بۆ دەکەن، جا ئەگەر تۆش زۆر خۆتیان لەگەڵ خەریك بکەیت و مەشغوڵ بیت پێیانەوە، ئەوا دەیانوروژێنیت و بە جارێك تۆپەڵێك هەنگ لێت دەئاڵێن و، ڕەنگە یەك دوانێکیان پێتەوە بدەن.

بەڵام گەر هیچ هەقت بەسەریانەوە نەبێت و خۆت نەشڵەژێنیت، ئەوانیش بڵاوەی لێ دەکەن و هیچ زیانت پێ ناگەیەنن.

ئێمەش هەروەك ئەم نموونەیە نابێت زۆر بە بەڵاكانەوە سەرقاڵ بین و مەراقیان لێ بخۆین و، بیر لە ئەگەری خراپتربوونیان بكەینەوە، بەڵكو پێویستە پاش گرتنەبەری ڕێگەچارەی پێویست ئیتر لێیان بگەڕێین و ئەنجامەكان حەواڵە بە خوای گەورە بكەین.

جگە لەوەش نابێت لە ئاست بەڵاكاندا پەست و تووڕە بین و هاوار و ناشوكری بكەین، بۆ نموونە گەر هەنگێك پێوەی داین بڵێین: "ئەمە لە كوێوە هات؟ هەر منی دۆزیەوە یەكسەر پێمەوە لكا!".

مرۆڤ ئەگەر زەردەخەنەیەك بێتەسەر لێوی بەڕووی ئەو كەسەی وا هەڵچووە و هاوار دەكات، ئەوا ئەویش یەكسەر جۆرە هێوربوونەوەیەكی بەسەردا دێت و، وردە وردە بابەتەكەی لا بچووك و سادە دەبێتەوە و، لە كۆتاییدا هەموو شتێك بە خێر و خۆشی تەواو دەبێت. هەروەها ئەگەر مرۆڤ لە بەرامبەر بەڵاكانیشدا پشت بە خودا ببەستێت و، بڕوای وابێت كە هەموو شتێك لەلایەن ئەو زاتەوەیە، ئەوا بە تێپەڕبوونی كات كۆڵ و باری بەڵاكانی لەسەر شان سووك دەبێت و شوێنەوارەكانیشیان نامێنێت.

* * *

جگە لەوانەش، بەڵا و موسیبەتی ئایینیش هەیە، كە پێویستە هەمیشە پەنا بەخودا بگرین لە شەڕیان.

– موسیبەتی ئایینی چییە؟

– ئەو هەموو هێرش و پەلامارانەن کە بۆ سەر ئایین و، ئیمان و، قورئان و، بەها پیرۆزەکانمان دەکرێن.

بۆ نموونە ڕێگەت پێ نەدرێت بە سەربەستی نوێژ و، ڕۆژوو و، یان فێربوونی قورئان و پەیڕەوکردنی ڕێنماییە ئایینەکانت بکەیت.

یا کەس و لایەنێك لە ئاست بەها پیرۆزەکانی ئایینەکەتدا زماندرێژیی بکەن و سنوور ببەزێنن و، بیروباوەڕی ئیسلامەتیت بە بچووك و کەمنرخ و دواکەوتوو وەسف بکەن.

تۆش ناتوانیت هەمیشە وەڵامی پێویستیان بدەیتەوە و، ناچار زۆربەی کاتەکان بێدەنگ دەبیت. واتە گەر گاڵتەش بە ئیمانداران بکەن تۆ ناتوانیت دەمیان پێ دابخەیت. ئیتر لەم کاتەدا جگە لە پشت بەستن بەخودا و ڕووکردنە قاپیی میهرەبانیی ئەو، هیچ دەروو و دەرگایەکی دیکەت بۆ نامێنێتەوە.

– باشە لەم کاتەدا چی بکەین؟

– دەستت بەرز بکەوە و لە خودا بپاڕێوە و، داوا لەو بکە و، بۆلای ئەو بگەڕێوە.

ئیتر لەبەر ئەمەیە کە موسیبەتی هەرە سامناك و زیانبەخش ئەوەیە کە ڕوو لە ئایین دەکات.[1]

---

١– لە (بریسکەی دووەم)ەوە وەرگیراوە.

## خوایە گیان، دیسانەوە وەسوەسە!

## دووبارە بیروهۆشم پەرتەوازە بووەوە!



هەروەك چۆن دەتوانیت بیر لە شتی جوان بکەیتەوە، هەر واش دەتوانیت بیر لە شتی خراپە بکەیتەوە.

چۆن بیرۆکەی ڕاست و دروست بە بیروهۆشماندا دێت، واش بیرۆکە و شتی هەڵە بە بیروهۆشماندا دێت.

چۆن شتێکی جوان بە خەیاڵماندا دێت، بەو جۆرەش دەکرێت شتێکی ناشیرین بە خەیاڵماندا بێت.

هەروەك چۆن شتی گونجاومان سەبارەت بە ئیسلام بەبیردا دێت، ئاوەهاش شتی نامۆ و دژ بە ئیسلاممان بە بیردا دێت.

هەروەك چۆن بیری باش و جوان دەربارەی خودا پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ بە خەیاڵماندا دێت، بەو جۆرەش دەشێت بیری خراپ و نابەجێ بە بیرماندا بێت.

بۆ نموونە، هەر کە (الله أكبر)ت کرد و نوێژت دابەست، یەکسەر... ئەی خوایە! ئەوە چییە؟ لە ناکاو خەیاڵت بۆ شوێنێکی بەدڕەوشتی و خراپ و نەشیاو دەچێت.

* * *

- (وەسوەسە) چییە؟ بۆچی تووشی دەبین؟ خۆمان دەیسازێنین؟

- سەرەتا ئێمە خۆمان نامانەوێت بیر لەو شتە خراپە بکەینەوە، واتە بە ویستی خۆمان نایەتە خەیاڵمانەوە.

- دەی باشە کێ خەیاڵمان بەو شتە نابەجێیانەوە قاڵ دەکات؟

- بێگومان شەیتان... خۆ ئیشەکەی هەر ئەمەیە، واتە عەقڵ و خەیاڵ و بیروهۆشمان بە شتی واوە قاڵ دەکات. هەروەها دڵ و گیان و دەروونمان دەشێوێنێت و، ورەمان دەڕوخێنێت.

ئەو شەیتانە هەوڵ دەدات لە نوێژ ساردمان بکاتەوە و، بێزارمان بکات و، حەزمان بۆ نوێژکردن نەهێڵێت...

- باشە لەم بارەدا چی بکەین؟

- سەرەتا نابێت هەڵەشە بین و پەژارە دامان بگرێت و لە خودی خۆشمان پەست و بێزار بین، هەروەها خۆمان تاوانبار ناکەین و، نالێین: "ئەرێ بۆ کارمان بێرە گەیشت؟".

پاشان زۆر لەسەریان ناوەستین و، گرنگییان بۆ دانانێین و، لەبەر چاومان گەورەیان ناکەین و، لە مێشکی خۆماندا نایانهێڵینەوە و، بیرمانی پێوە خەریك ناکەین.

چونکە ئەو خەیاڵانە هەمووی کاری شەیتانی نەفرەتلێکراوە.

* * *

- وەسوەسە لەچی دەچێت؟

- لەو مار و ئەژدیها و شتانە دەچێت کە لە تەلەفزیۆندا دەیانبینین.

خۆ وێنەی ماری سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکە ئازارتان نادات و زیانتان پێ ناگەیەنێت، بەڵام ئەگەر لە هیچی خۆڕایی خۆتان بترسێنن، ئەوا کارێکی هەڵەتان کردووە.

گەر لە تەلەفزیۆنەکەدا دیمەنی شتێکی پیس ببینیت و بڵێیت: "دەستم پیسبووە و با بچم بیشۆم"، هەمووان پێت پێ دەکەنن.

لەبەر ئەوە پێویستە بە ژیرانە مامەڵە بکەین و درێژە بە نوێژەکەمان بدەین و نەیبڕین، چونکە زانیمان و دڵنیابووین ئەو

وەسوەسە و دیمەنە ناشیرینانە لەلایەن شەیتانەوەن و، دەبێت ئێمە لە کار و پەرستنی خۆمان بەردەوام بین.

* * *

هەموو ئەو بیرە خراپانەی شەیتان لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ لە خەیاڵماندا دەیسازێنێت بێ نرخ و بەهان.

پێغەمبەر ﷺ مرۆڤێکی ئاسایی و سادە بوو نەك فریشتەیەك.

پێغەمبەریشمان ﷺ وەك ئێمە برسی بووە و، تینووی بووە و، نانی خواردووە و، ئاوی خواردووەتەوە.

نەخۆش کەوتووە و، گەرما و سەرما کاری تێکردووە و، ڕێوشوێنی پێویستی لەبەرامبەر دوژمنەکانیدا گرتووەتەبەر. لە کاتی پێویستیدا ناچاربووە شەڕی لە دژی دوژمن کردووە و، بریندایش بووە.

منداڵی بووە، منداڵی وەفاتی کردووە، بە مردنیان خەمبار بووە و بۆیان گریاوە.

بەڵام هیچ کاتێك وەك پێغەمبەرێك تاوانی ئەنجام نەداوە و، هەرگیز توخنی کاری ناشیرین و ناڕەوا نەکەوتووە.

هەمیشە بە پاك و بێگەردی ماوەتەوە و، بە داوێنپاکی ژیاوە و، مرۆڤێکی بێ کەموکورتی بووە و، ژیاننامەیەکی پڕ پەند و ئامۆژگاریشی بۆ ئێمەی موسوڵمان جێ هێشتووە.

لەبـــەر ئـــەوە هـــەر وەسوەســـەیەك كـــە شـــەیتان دەربـــارەی پێغەمبـــەرمان ﷺ بیخاتـــە بـــیر و خەیاڵمانـــەوە ڕاســـت نییـــە و هـــیچ بنەمایەكی نییـــە، چـونكە خـۆ نابێـت بـڕوا بـە هـیچ شـتێك بكـەین كـە سەرچاوەكەی شەیتان بێت، بەڵكو پێویستە لەسـەری ڕانەوەسـتین و، لامان گرنگ نەبێت، هەروەها بە هەموو شێوەیەك بەرپەرچی بدەینەوە و، بەرەنگاری ببینەوە.

– ئـــەو شـــتە خراپانـــەی دەربـــارەی پێغەمبـــەر ﷺ دێـــت بـــە خەیاڵماندا ئەگەری ڕوودانیان هەیە؟

– بەڵێ دەكرێت، بەڵام خۆ نەبووە.

بۆ نموونە، ئا لـەم سـاتەدا دەكرێـت دەریـای (ناوەڕاسـت) وشـك بكات و، شوێنەكەی ببێت بە بیابانێكی وشك و كاكی بەكاكی.

– بەڵام ئایا لە ئێستادا ئەو شتە ڕوویداوە؟

– نەخێر.

– قەت دیوتانە "ڕەنگە ببێت" و "بووە" یـەك واتایـان هـەبێت؟ بێگومان نەخێر، یەكسـانی واتـای ئـەم دووانـە لەگـەڵ عـەقڵ و ژیریـدا یەكناگرێتەوە.

جارێ هیچ هۆكارێك نییە بۆ ئەوەی ئەو ئەگەرە ڕوو بدات، پاشان تا ئێستە شتێكی وا ڕووی نەداوە.

لەبەر ئەمە زۆر بیرکردنەوە لە شتێك کە "دەشێت ڕوویدات" زیانە بۆ عەقڵ و، نەك هەر هیچ پێویست نییە، بەڵکو زیانیشی هەیە.

هیچ پێویست ناکات لەسەر ئەو بیرە نەشیاوانە هەڵوێستە بکەیت کە شەیتان دەربارەی پێغەمبەر ﷺ لە خەیاڵتدا دەیانسازێنێت.

هیچ پێویست ناکات کە خۆمان بە گومانێکەوە یان بە وەسوەسەیەکەوە بخافڵێنین کە ڕووی نەداوە و، بوونی نییە.

لەلایەکی دیکەشەوە گەر ئەم خەیاڵ و بیرە نادروستانەی بە خەیاڵماندا دێن، هیچ زیانێك بە ئیمانمان نەگەیەنن، ئەوا هیچ بەرپرس نین لێیان.

گەر توانیمان ئەم وەسوەسە شەیتانیانە کۆنتڕۆڵ بکەین و، پشتگوێیان بخەین، ئەوا هیچ تاوانێکمان لەسەر تۆمار ناکرێت.[١]

---

١- لە (بریسکەی سیازدەیەم)ەوە وەرگیراوە.



# یارییە ترسناکەکەی شەیتان

شەیتان لە قورئاندا بە (ئیبلیس) ناوی براوە.

ڕەنگە بیستبێتتان کە ئەگەر کەسێك خەڵك فریو بدات و، چەواشەیان بکات و، کاری ڕەوا و ناڕەوا لەیەك جیانەکاتەوە و، زۆربڵێ و، تەڵەکەباز بێت، ئەوا پێی دەڵێن: "هەر ئەڵێی ئیبلیسە!".

تەنها ئەرکی ئیبلیس ئەوەیە مرۆڤەکان و، بە تایبەت موسوڵمانەکان فریو بدات و، لەڕێیان لا بدات و، بەرەو درۆکردن و بێ باوەڕی و تاوان و حەرام ڕایان بکێشێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا شەیتان فێڵ و یارییەکی هەیە، کە زۆر هەستی پێ ناکرێت، ئەویش ئەوەیە کە لای ئەو کەسانەی کە خواپەرست و گوێڕایەڵی خوان هەستی ئینکاری لە بوونی خۆی (واتە بوونی شەیتان) گەڵاڵە دەکات و، وا تێیان دەگەیەنێت کە ئەم (واتە شەیتان) بوونی نییە.

ئەو کەسانەی گرفتاری ئەم یارییەی شەیتان بوون، باوەڕیان لاواز بووە و، دەڵێن: "بابە شەیتانی چی؟ بۆ کەس دیویەتی تا من بڕوام پێی هەبێت! ئەوەنەش بڕوا بە قسەی ئەم و ئەو مەکەن!".

ئەم کەسانە هەروا هەڕەمەکی قسە دەکەن و دەڵێن: "جنۆکە و فریشتە و شەیتان و ئەم شتانە قسەی هیچن، ئەمانە هیچ بنەمایەکیان نییە، هەمووی قسەی هەڵبەستراون و خەڵکی ساویلکەی پێ ئەترسێنرێ!".

لە ڕاستیدا قسە و قەناعەتەکەی ئەمان ساویلکانەیە، چونکە هیچ بەها و سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو و ڕاستیان بەدەستەوە نییە.

ئەو کەسەی نکوڵی لە بوونی شتێك دەکات، بوونی شتێك ڕەت دەکاتەوە کە هەیە.

تۆ دەتوانیت بڵێیت: "بەڕای من ئەو شتە نییە"، بەڵام ناتوانێت بڵێیت: "بەدڵنیاییەوە ئەو شتە نییە".

ئەگەر لەخۆتەوە و بێ هیچ بنەمایەك بڵێیت: "بە دڵنیاییەوە ئەو شتە نییە"، ئەوا پێت دەڵێن: "فەرموو نەبوونی بسەلمێنە"، دیارە لێرەشدا دەستەوەسان دەبیت و نازانیت چۆن بیسەلمێنیت.

ئێمە لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە نکوڵی لە بوونی شەیتان دەکەن، دەڵێین: "ئەگەر لەسەر زەوی نەبن، دەشێت لەسەر هەسارەکانی دیکە یاخود لەسەر ئەستێرەکان هەبن".

ئەگەر بەچاو نایانبینین، خۆ بە هەستەکانی دیکەمان دەیانبینین. بۆ نموونە، بە عەقڵ و دڵ و ڕۆحمان هەست بە بوونیان دەکەین، چونکە فریشتە و جنۆکە و ئەو شتە ڕۆحانیانە بەچاوی خۆمان نابینین، بەڵام بە زۆر شێوازی جیاوازی دیکە هەست بە بوونیان دەکەین.

* * *

بۆ نموونە:

ناتوانین بڵێین لەناو مرۆڤەکاندا کەسانی خراپ و، بێ ڕەوشت و، درۆزن و، فێڵباز و، پیاوکوژ و، ئابڕووبەر نین، چونکە بێگومان کەسانی لەمشێوەیە هەن، بگرە زۆریش نەك کەم، هەر لە دەوروبەری خۆمان بڕوانین ئەو جۆرە کەسانە دەبینین.

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت: (هەموو پێغەمبەرەکانی تریش دوژمندار بوون لە گومڕاکانی بنیادەم و جنۆکە، ئەو دوژمنانە لەناو خۆیاندا قسەی ڕووکەش و درۆودەلەسەیان بە یەکتر ئەگەیاند و ئەیانچپاند بە گوێی یەکتردا و بە هەموویانەوە خەریکی بەدکاری و

دوژمنایەتیی پێغەمبەران بوون و سەرکەش و لەخودانەترس بوون..)
الأنعام:١١٢.

لە ناو پەری (جنۆکە)کانیشدا جنۆکەی باش و خراپ هەیە، بە خراپەکانیان دەوترێت شەیتان.

ئەوە نییە خودا لە قورئاندا دەفەرموێت: (..شەیتان نەبێ کە لە بەرەی جین بوو لە فەرمانی خودا دەرچوو و سوجدەی نەبرد..)
الکهف:٥٠.

واتە ئەگەر لە ڕستەیەکدا کۆی بکەینەوە، ئەگەر مرۆڤی شەیتانئاسای بینراو هەبێت، ئەوا جنۆکەی شەیتانئاسای نەبینراویش هەیە.

تێکچوونی شتێکی باش و بەنرخ هەر وەك تێکچوونی شتێکی سادەوساکار نییە، چونکە تێکچوونی شتە باشەکان زۆر خراپتر دەبێت.

بۆ نموونە، گەر ماست تێك بچێت، واتە ترش ببێت، دەیژەنین و دەیکەینە دۆ و هەڵی دەقوڕێنین، بەڵام ئەگەر ڕۆنەکەرە خراپ ببێت، دەبێتە ژەهر و بە هیچ کەس ناخورێت و، کەڵکی هیچی پێوە نامێنێت.

دەی کەواتە بەنرخترین و بەڕێزترین بوونەوەریش کە مرۆڤە، گەر تێکچوونێکی بەسەردا بێت و، لەڕێ دەربچێت، دەبێتە جانەوەرێکی ترسناك.

هەر وەك مار و دووپشك کە چێژ لە پێوەدان و ژەهراویکردنی دەورویەریان وەردەگرن، ئەم کەسە خراپەش چێژ و خۆشی لە بێباوەڕی و، بێڕەوشتی و، ستەم کردن دەبینێت، واتە وەك شەیتانی لێ دێت.

دەی گەر لە نێوان مرۆڤەکاندا کەسانێك هەبن وەك شەیتان و شەیتانئاسابن، کەواتە لە ناو جنۆکەکانیشدا جنۆکە هەیە کە بووبێتە شەیتانی نەفرەتلێکراو.

* * *

لە نێوان مرۆڤ و جیهانی گەردوونی مەزندا، زۆر لەیەکچوون و پەیوەندیی نزیك هەیە.. واتە ئێمەی مرۆڤ جیهانێکی بچووکین و، جیهانیش مرۆڤێکی گەورەیە.

گەر ئەم گەردوونە بچووك بکرێتەوە دەبێت بە مرۆڤ و، گەر مرۆڤیش گەورە بکرێت دەبێتە گەردوون.

ئێمە وەك مرۆڤەکان پوختە و کورتەی گەردوونین.

لە ئێمەدا هەرچیەك هەبێت لەو گەردوونە زەبەلاحەشدا هەیە.

ئەو شتانەی لە ئێمەدان بچووکن و تەنها نموونەیەکن، شتە سەرەکییەکان لە ناو گەردوون و جیهانی گەورەدان.

– چۆن؟ وەکو چی؟

– گەر ئێمە توانای یادگە و لەبەرکردنمان هەبێت، لە گەردوونیشدا (لەوحی مەحفوظ) هەیە.

(لەوحی مەحفوظ) خشتە و دەفتەری تۆماری قەدەری هەموو بوونەوەرانە.

شەیتان لەناو دڵەکانماندا ناوەندی وەسوەسەی هەیە، کە لە ڕێگەی ئەم ناوەندانەوە وەسوەسەمان بۆ دروست دەکات و، ئێمە بەرەو تاوان و هەڵەکردن دەبات.

* * *

شەیتان لە دڵەکانمانەوە نزیکە، هەر لەبەر ئەمەیە کاتێک کە ڕووبەڕووی تاوانێک دەبینەوە، سەرەتا دڵمان بۆی لێ دەدات و بێتاقەت دەبێت.

گەر بە وردی سەرنج بدەین، دەتوانین بڵێین دڵمان زەنگ لێ دەدات و، لە مەترسییەك بۆ سەر گیانمان ئاگادارمان دەکاتەوە و، دەڵێت: "ئاگاداربە، ئەمە لەلایەن شەیتانەوەیە، ئاممان بەگوێی نەکەیت!".

هەر وەك ئەوەی كە لە نزیك دڵمانەوە شوێنێك یا ناوەندێك هەیە بۆ تەڵەكانی شەیتان، لە گەردوونیشدا (ئیبلیس)ی سەرگەورەی شەیتانەكان هەیە.

هێزێك لە ناخماندا هەوڵ دەدات لە ڕێگەمان لا بدات و، بەرەو تاوان و سەرپێچی كردن ڕامان بكێشێت، كەواتە هێزێكیش هەیە لە جیهانی دەرەوەدا كە ئەم دەنگەی لێوە دێت، ئەویش شەیتانە.

واتە كەس ناتوانێت نكوڵی لە بوونی شەیتان بكات.

چۆن دەگونجێت مرۆڤ دوژمنی خۆی بە نەبوو دابنێت و، هیچ حسابێكی بۆ نەكات و، هەروەش بزانێت كە هەواڵی نەبیستووە و، بڕوا بە بوونی نەكات؟!

پەروەردگاری مەزن، لە شەیتان و كەوتنە یارییەكانی و فریوخواردن بە فێڵەكانی بمانپارێزێت.[1]

---

١– لە (بریسكەی سیازدەیەم)ەوە وەرگیراوە.

# ترسناکترین تەڵەی شەیتان



"نەبینینی هەڵە و چەوتی، هەڵەیەکە کە لە خودی هەڵە نەبینراوەکە هەڵەترە.

دان بە هەڵەدا نەنان، لەکە و نەنگییەکی زۆر گەورەیە، بەڵام ئەگەر تۆ هەڵەی خۆت ببینیت، ئەوا ئەو هەڵەیە لە هەڵەیی دەردەچێت. هەروەها ئەگەر ئاورێك لە هەڵەکانت بدەیتەوە و لە ئاستیاندا بەداخەوە بیت، ئەوا شایستەی بەخشین دەبێت".

شەیتان بەردەوام داو لەدوای داومان بۆ دەنێتەوە و، هەمیشە خەریکی تەڵەکەبازییە بۆمان.

بێ وەستان، چاڵمان بۆ هەڵدەکەنێت و، بەربەستمان لە ڕێ دادەنێت...

واتە هەرگیز نامێڵێت هەناسەیەکی ئاسوودە هەڵبمژین.

دەست لە هەموو کارێکمان وەردەدات، خۆی لە هەموو ئیشێکمان هەڵدەقورتێنێت.

بەردەوام بەدوای خاڵی لاوازماندا دەگەڕێت تا بیقۆزێتەوە.

هەر هەلێکی بۆ بڕەخسێت، بەزەیی بەکەسدا نایەتەوە و، یەکسەر بە فێڵێك فریوی دەدات و چەواشەی دەکات.

هێندەش بە وەستایانە کارەکەی خۆی دەکات، کە موسوڵمانانی لاواز هەر زوو گوێڕایەڵی دەبن.

لەبەر ئەمە پێویستە لە بەرامبەر ئەم گەمانەی شەیتاندا زۆر وریا و چاوکراوە بین و، نابێت بواری بدەین فێڵمان لێ بکات.

یەکێك لە یاریەکانی شەیتانیش ئەوەیە کە:

وا لە مرۆڤەکان دەکات دان بە هەڵەکانیاندا نەنێن، لە بەرامبەریشدا هەر وەك پارێزەر پاساو بۆ هەڵە و تاوانەکانیان دەهێنێتەوە.

بۆ نموونە دەڵێت: "تۆ هیچ تاوان و هەڵەیەکی وات نەکردووە، هەموو کەسێك ئەم کارەی تۆی کردووە، کەواتە هەر بیریشی لێ مەکەوە، خۆ ئەوانەی بە تاوانبارت دەزانن لە تۆ تێناگەن، چونکە تۆ لەسەر هەقیت. ئەصڵەن هەرچیەك هەیە لەبن سەری ئەوانەدایە ! " .

ئیدی شتگەلێکی وەك ئەمە و زۆر زیاتریشمان لا گەلاڵە دەکات.

ئەوەی ئەم هەستانەمان بۆ دەسازێنێت (شەیتان)ە.

ئیتر هەر کەسێك گوێ بۆ شەیتان بگرێت و شوێنی بکەوێت، نایەوێت هیچ هەڵە و کەموکورتییەك و، تاوانێکی خۆی ببینێت.

گەر بیشیبینێت، دانی پێدا نانێت، گەر قبوڵیشی بکات هەزار بیانووی بۆ دەهێنێتەوە تا خۆی بەڕاست نیشان بدات؛ چونکە لەم کاتەدا بە چاوێکی باش لە خۆی دەڕوانێت و، هەموو کارەکانی بە باش دەزانێت.

جگە لەوەش گەر ئەو هەڵانەی کردبێتە خوو، نایەوێت هەرگیز وازیان لێ بهێنێت.

هەرچەندە دەزانێت کە بە خووگرتنی بەم هەڵانەوە دەبێتە بنێشتەخۆشەی سەر زاری خەڵك، بەڵام لەو خووە ناشیرینانەی پاشگەز نابێتەوە و، بەردەوام دەبێت لەسەریان.

بەڵام ئەگەر بێتو هەڵەکانی قبووڵ بکات و، دان بە تاوانەکانیدا بنێت و، پاساو و بیانوو بۆ خۆی نەهێنێتەوە، ئەوا قازانجێکی زۆری دەست دەکەوێت.

یەکەم شت تەوبە دەکات، واتە دان بەهەڵەکەیدا دەنێت و هەست بە پەشیمانی دەکات.

دووەم، داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکات و، لە کردەوەکانی پەشیمان دەبێتەوە و، زۆر وریا دەبێت بۆ ئەوەی دووبارە ئەو هەڵانە نەکاتەوە.

سێیەم، لەبەر ئەوەی لە تەڵەی شەیتان کەوتبوو، ئیتر پەنا بە خودا دەگرێت لە شەڕی شەیتان، بەم جۆرەش لەو داوانەی شەیتان ڕزگاری دەبێت.

* * *

ئەی ئەگەر تەوبە نەکات، چی لێ دێت؟

پێش هەموو شتێك دەبێتە گاڵتەجار و یاری دەستی شەیتان؛ چونکە گەر مرۆڤ هەڵەی خۆی نەبینێت، ئەوا ئەم هەڵوێستەی هەڵەیەکی گەورەترە لە خودی ئەو هەڵەیەش کە نایەوێت بیبینێت.

واتە مرۆڤ دەکەوێتە بارێکەوە کە پێی دەڵێن: "هێشتا ئەویش قسە ئەکات؟ وەڵا هەر ناشڵێیت هەڵەی کردووە! ئەڵێی نە بای دیوە و نە بۆران".

بەڕاستی هەستکردن بە هەڵە و تاوان و دانپێدانانیان، فەزڵێکی زۆر مەزنە.

ئەگەر هەڵەیەکمان کردبێت، یان تاوانێکمان ئەنجام دابێت، بەڵام لە یادمان نەمابن، ئەوا خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فێرمان دەکات، چی بڵێین، کاتێك دەفەرمووێت: (خاوەن ئیمانەکان لە خودا ئەپاڕێنەوە و ئەڵێن: خودایا لێمان مەگرە و سزامان مەدە ئەگەر واجبێکمان لەبیرچوو یا هەڵەیەکمان کرد. خودایا! باری گران مەخەرە سەرشانمان وەك ئەو بارە گرانەی خستبووتە سەر شانی نەتەوەکانی

پـێش ئێمـه. خودایـا! بارێکمـان مـه‌ده به‌سـه‌ردا توانامـان به‌سـه‌ریا نه‌شکێ، له گوناهمان ببووره و تاوانمـان بپۆشـه و بـه‌زه‌ییت پیامانـدا بێتـه‌وه و میهره‌بانیمـان له‌گـه‌ڵ بفـه‌رموو. تـۆ گـه‌وره‌مانی. تـۆ په‌روه‌ردگارمانی و سه‌رپه‌رشتیمان ئه‌که‌یت، زاڵمان بکه به‌سه‌ر کافره بێ دینه‌کاندا) البقرة:٢٨٦.

واته به کورتییه‌که‌ی داوای لێبووردن بکه‌ین و بڵێین: "خودایه، داوای لێبووردن ده‌که‌م، جارێکی دیکه دووباره‌ی ناکه‌مه‌وه". [١]

---

١- له (بریسکه‌ی سیازده‌یه‌م)ه‌وه وه‌رگیراوه.



# نەتەوە و ڕەگەزپەرستی کارێکی دروستە؟

مرۆڤــەکان هەنــدێکییان ئینگلیــزن، هەنــدێکیان فەڕەنســین، هەندێکیشـیان ئیتـاڵین، هەندێکیشـیان ڕووســن، تـوورکن، کـوردن، عەرەبن...

ئــەم مرۆڤانــە هەنــدێکیان مەســیحین، بەشـێکی دیکەشــیان بیروباوەڕی دیکەی تایبەت بەخۆیان هەیە.

گـەر بێینـە سـەر موسوڵمانان، ئـەوا ئـەوانیش بەسـەر میللـەت و نەژادی جیاجیادا دابەشبوون.

هەنـدێکیان عـەرەبن، هەنـدێکیان تـوورکن، هەنـدێکیان کـوردن، هەندێکیان شیشانین، هەندێکیان مالیزی و، هەندێکیشیان پاکستانی و هنـدین، لـەپاڵ ئەمانەشـدا لـە نـاو هـەموو میللەتەکانـدا کـەم تـا زۆر موسوڵمان هەیە.

هیچ کەسێك بەر لەوەی بێتە دنیا و، پاش لەدایکبوونیشـی نـەژاد و نەتـەوەی خـۆی هەڵنابـژێرێت، چـونکە ئـەم هەڵبژاردنـە لەدەسـتی

خۆیدا نییە، واتە هەروەك چۆن كەسمان توانای هەڵبژاردنی دایك و باوكمان نەبووە، توانای هەڵبژاردنی میللەتەكەشمان نییە.

كەواتە تورك بوون، یان كورد بوون، یان عەرەب بوون، یان هەر نەژادێكی تر بوون شتێك نییە مایەی لەپێشینەبوون و، خۆ بەباشترزانین بێت.

تەماشا بكەن خودا چۆن ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كاتێك لە قورئاندا دەفەرمووێت: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! با هیچ كۆمەڵە پیاوێ گاڵتە بە كۆمەڵە پیاوێكی تر نەكا، لەوانەیە ئەو كۆمەڵە پیاوە گاڵتەپێكراوە لە كۆمەڵە پیاوە گاڵتەپێكەرەكە چاكتر بن و، با هیچ كۆمەڵە ئافرەتێ گاڵتە بە كۆمەڵە ئافرەتێكی تر نەكا، لەوانەیە كۆمەڵە ئافرەتە گاڵتەپێكراوەكە لە كۆمەڵە ئافرەتە گاڵتەپێكەرەكە چاكتر بن و، غەیبەتی یەكتر مەكەن چونكە كە غەیبەتی یەكترتان كرد ئەوە وەك ئەوە وایە خۆتانتان عەیبدار كردبێ لەبەر ئەوە كە موسوڵمانان هەموو یەكن و، ناو و ناتۆرەی ناشیرین و خراپیش بە یەكترا هەڵمەدەن، زۆر بەدناوییە بۆ موسوڵمان ئەمە كە پاش ئیمان هێنانی بە خوا و، موسوڵمان بوونی ناوبانگی بە لەدیندەرچوون بزڕێ و، هەر كەسیش تۆبە نەكا لە گوناهی ئەم كردەوانە و پاشگەز نەبێتەوە لێیان، ئەوانە ستەمكارن و ستەمیان لە خۆیشیان و لە خەڵكیش كردووە) الحجرات: ١١

هـەر ئـەو زاتـەی دایـك و بـاوكی بـۆ هەڵبـژاردووین، میللـەت و نەژادیشمان بۆ دیاری دەكات.

لەبەر ئەمەیە كـە هـیچ میللـەتێك و هـیچ نـەژادێك لـە میللـەتێك و نەژادێكی دیكە بەڕێزتر و مەزنتر نییە.

– كەواتە كێ باڵادەست و بەڕێزە؟ ئەی پێوەری ڕێزداری چییە؟

– خـوای گـەورە لـە قورئانـدا دەفەرموویـت: (ئـەی خەڵكینـە! بێگومان ئێمە هەموو ئێوەمـان لـە پیـاو و ژنـێ دروسـت كـردووە كـە ئـادەم و حـەووان و، ئێوەمـان كـردووە بـە چـەند نەتـەوە و هـەر نەتەوەیەك بە چـەند خێـڵ و هـۆز كـە بچـنەوە سـەر یـەك بنەچـە، بۆ ئەوەی لەناو خۆتانا یەكتر بناسن. بەڕاستی بـە قـەدر و حورمـەتترتان لای خوا ئەوەتانە زۆرتر لە خوا بترسێ و خۆی لە گوناهـ بپارێزێ. خوا هەموو شتێ ئەزانێ و لە هەموو شتێ ئاگادار و شارەزایە) الحجرات: ١٣.

واتـە بـەڕێزترین و مـەزنترین مـرۆڤ، ئـەو كەسـەیە كـە خـودا زۆر بەباشـی دەناسـێت و، زۆری خـۆش دەوێـت و، وەك پێویسـت لێـی دەترسێت.

– ئـەی خـوای گـەورە نەیـدەتوانی هـەموو مرۆڤـەكان بـە یـەك میللەت و یەك نـەژاد و نەتـەوە بـەدیبهێنێت؟ لەبـەر چـی ئـەم هـەموو میللەتە جیاوازانەی بەدیهێناوە؟

- بێگومـــان خـــوای گـــەورە دەیتـــوانی، بـــەڵام نـــەیکرد، حیکمەتەکەشی لە ئایەتەکەدا ڕوون کردووەتەوە..

واتــە ئــەم فــرە نەژادییــەمان بــۆ ئەوەیــە کــە یــەکتر بناســین و پەیوەندی کۆمەڵایەتیمان بەهێزتر بێـت و، هاوکـاری یـەکتر بـین، نـەك بۆ ئەوەی وەك بێگانـە مامەڵـە لەگـەڵ یـەك بکـەین و، ببینـە دوژمنـی یەکتر..

* * *

بۆ نموونە:

هەموو سـەربازێك بـە پێـی پلـە و یەکـە و بەشـەکەی لـە سوپادا پەیوەندی و ئەرکی تایبەت بە خۆی هەیە. بەڵام لەهەمان کاتدا هەموو سـەربازەکان بــە پلەجیاوازەکانیانــەوە لــەکاتی هەسـتیار و هێرشـی دوژمندا هەمان هەڵوێست دەنوێنن، کـە بریتییـە لـە ئامـادە بـوون بـۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی دوژمن و بە ساغ و سەلامەتی دەرچوون.

خۆ ناکرێت بڵێین ئەم جۆرە دابەشکردنەی سـوپا بـۆ سـەر چـەند بەش و یەکەیەکی جیاجیا بۆ ئەوەیە ببنە دوژمـنی یـەکتر و بـە یەکدا هەڵبشاخێن و ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە.

ئیدی هەروەك ئەمە، هەموو موسوڵمانانی ئـەم سـەردەمەش وەك سـوپایەکن، کــە دابەشــبوون بەســەر میللەتانـدا و، هێنـدەش خـاڵی هاوبەشیان هەیە کە لە ژمارە نایەن.

یەکەم شت بەدیهێنەریان یەکە، ڕۆژیدەریان یەکە، پێغەمبەریان یەکە، پەرتووکیان یەکە و، سەدان و هەزاران یەك و خاڵی هاوبەشی دیکەشیان هەیە.

ئەم هەموو یەکبوون و یەکسانییە پێویستی بە خۆشەویستی و برایەتییە. کەواتە ئەم هەموو جیاوازییەش بۆ یەکتر ناسین و هاوکاری کردنە، نەك بۆ ڕق لەیەکتری بوون و دوژمنایەتی یەکتر کردنە.

* * *

ئایینەکەمان، هەستی نەتەوایەتی قبوڵە و لای پەسەندە و دژی نییە، بەڵام ڕەگەزپەرستی و میللەت سالاری بە باش نازانێت.

مێژووش شاهیدە کە چۆن بیری (میللەتی شکۆمەند و پلەیەك) و (نەژادی پلەیەك) بووەتە هۆی سەرهەڵدانی چەندین جەنگ و، بە کوژرانی ملیۆنان خەڵك کۆتایی هاتووە.

لایەنگرانی ئەم جۆرە تێگەیشتنە کەسانی بەدەر لە میللەت و هۆزی خۆیان بە کەم وەسف دەکەن و، مرۆڤەکان بەپێی ڕەنگ و نەژادیان هەڵدەسەنگێنن.

تەنانەت تا ئەم ساڵانەی دواییش لە چەند وڵاتێکی پێشکەوتوودا ڕەشپێستەکان لە زۆر ماف بێبەش بوون و، بەیەکچاو لەگەڵ سپی پێستەکاندا سەیریان نەدەکرا.

* * *

هەموو کەسێك میللەتەکەی خۆی خۆشدەوێت و، خزمەتی دەکات و، دەیەوێت بەرەو گەشەسەندن ئاڕاستەی بکات.

هەر ئەمەش نیشتیمانپەروەریی ئەرێنی و، تێگەیشتنێکی ڕاست و دروستە، بەڵام بەو مەرجەی سەرنەکێشێت بەرەو بە کەم تەماشاکردنی میللەتەکانی دیکە و، دوژمنایەتی و دووبەرەکی نانەوە لە ڕیزی نەتەوەکانی دیکەدا.

خۆ گەر کەسێك بیەوێت بزانێت فلان لە چ نەژادێکە و فیسار لە کوێوە هاتووە، ئەوا دەبێت لە (لەوحی مەحفوظ)دا بۆی بگەڕێت، کە ئەمەش مەحاڵە! واتە عیلمی ئەمانە بەس لای خوا گەورەیە.[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیست و شەشەم)ەوە وەرگیراوە.

## خەون چۆن لێك دەدرێتەوە؟



خەونەکان هەندێك جار وەکو خۆیان دێنە دی، هەندێ جار لە پشت پەردەیەکی تەنکەوە مانایەك دەبەخشن و، هەندێك جاریش لەپشت پەردەیەکی ئەستورەوە مانایەکیان شاردووەتەوە.

زۆرجار بە هاوڕێیەکمان دەڵێین:

– ئەمشەو خەوێکم بینی.

ئەویش پێمان دەڵێت:

– خێربێت ئینشائەڵڵا! خەوت بە چییەوە بینیوە؟

ئێمەش دەڵێین:

– بۆت دەگێڕمەوە، بەڵام دەبێت بۆم لێك بدەیتەوە...

ئیتر دەست بە گێڕانەوەی خەونەکەمان دەکەین و، چاوەڕێی ماناکەشی دەکەین.

چەنێکمان بیر مابێت بە جۆش و خرۆشەوە دەیگێڕینەوە، واتە هەر جێیەك گەڕابین، یا چیمان دیبێت، یا چیمان خواردبێت یا خواردبێتەوە؟ چیمان لەبەرکردووە؟...

هەندێك جار لە شیرینیی خەودا، خەونێکی زۆر خۆش دەبینین، بەڵام تاوێك بە خەبەر دێینەوە و دیسانەوە خەو دەچێتەوە چاومان، کەچی دەچینەوە سەر هەمان خەون.

جاری وا هەیە یەکێك خەبەرمان دەکاتەوە، بەڵام هێشتا چاوەکانمان نەکردووەتەوە، یا نامانەوێت بیانکەینەوە، چونکە حەز ناکەین لە خەونەکەمان بێدار بینەوە، لەبەر ئەوەی لە خۆشترین ساتی خەونەکەداین.

جار هەیە، چەند خولەك یا چەند کاتژمێر خەونێك بۆ کەسانی تر دەگێڕینەوە، کەچی هەر تەواو نابێت، یان چەندین لاپەڕەی لەسەر دەنووسین هێشتا هەر هەموو ئەوەمان نەگێڕاوەتەوە کە لە خەونەکەماندا دیومانە!

بە پێی توێژینەوەکان دوورودرێژترین خەون لە (٩٠) چرکە زیاتر ناخایەنێت، بەڵام خەونی ٣-٤ چرکەییش هەیە.

کەواتە خەون لەم ڕووەوە نیعمەت و بەخششێکی خودایە، فیلمێکی سینەماییە کە خودا لە خەوندا پیشانمان دەدات و، چێژێکە کە خۆمان یەك پێنج فلسیمان تێدا خەرج نەکردووە.

- چەند جۆر خەون هەیە؟

- سێ جۆر.

یەکەم: خـەونی ترسـناك، واتـە مۆتەکـە (کـابوس)، کـە شـەیتان نیشانی مرۆڤی دەدات.

دووەم: ئەو خەونانەی کە وێنەی ئەو شتانەمان نیشان دەدەنەوە کـە لـە ڕۆژەکـانی ژیانمانـدا گرنگیـان پـێ دەدەیـن و، سـەرنجمان ڕادەکێشن.

سێیەم: خەونی ڕاست (الرؤیا الصادقة)یە.

یەکەم جۆری خەون باشتر وایە هـەر بـۆ کەسـی بـاس نەکـەیت.. هەروەها بۆ ئەوەی لەم خەونانە خۆمان بپارێزین پێویستە نـزا بکـەین و، پەنا بە خوای گەورە بگرین.

جـۆری دووەمـیش هێنـدە ئـاڵۆز و تێکـەڵ و پێکەڵـە کـە شـیاوی لێکدانەوە نییە، ئەگەر بێتو کەمێکیشی بۆ لێکدانەوە بشێت واتایـەکی گرنگی وای نابێت. لەبەر ئەوە پێویست بە لێکدانەوەی ناکات.

خەونی سەرەکی و ڕاستی، خەونی ڕاست (الرؤیا الصادقة)یـە کـە جۆری سێیەمە.

لە خەونی ڕاستدا مژدەگەلێکی زۆر هەن کە دڵخۆشمان دەکـەن و ناخمان ئارام دەکەنەوە و، دڵمان پڕدەکەن لە ئاسوودەیی.

لـەم جـۆرە خەونـەدا چـەند پەڕەیـەك بـەڕووی جیهـانی غەیبـدا دەكرێتەوە و سەرەداوێك لـەو ڕووداوانـەی كـە هێشـتا ڕوویـان نـەداوە بەدەر دەكەوێت.

ئیـدی ئـەو خەونـەی كـە لێكدانـەوە هەڵـدەگرێت و قـابیلی گێڕانەوەیە ئەمەیە.

پێغەمبـەرمان ﷺ ئـەم ئامۆژگارییـەی كـردووین دەربـارەی ئـەم چەشنە خەونە، كە دەفەرمووێت:

"خەونی خـۆش لەلایـەن خوداوەیـە، هەركەسـێ خـەونی خۆشـی بینی، با تەنها بۆ خۆشەویستەكانی بگێڕێتەوە" .

* * *

- بۆچـی دەبێـت خـەونی خـۆش تـەنها بـۆ خۆشەویسـتانمان بگێڕینەوە؟

- چـونكە دەشـێت خـەون هـەموو كـات ڕوون و ئاشـكرا نـەبێت، هەنـدێ جـار وەكـو خـۆی دەردەچـێت و، هەنـدێ جـاریش لـە پشـت پەردەیەكی تەنك یان ئەستوورەوە مانایەكی شاراوەی تێدایە.

جاری وا هەیە خـەونێكی نـاخۆش دەبینـین، هـەر كـە خەبـەرمان بووەوە بێتاقەت دەبین و، ورەمان دەڕوخێـت و، خـەم دامانـدەگرێت، خۆ ئەگەر لە خەونەكەماندا كەسێك دۆستێك خزمێكمـان دیبێـت، ئـەوا پاش لەخەوهەستانمان ئەو كەسەمان هەر لە خەیاڵ دەبێت.

هەر بۆیە گەر خەونی ناوامان بینی ئەوا نابێت پەلە بکەین، بەڵکو دەبێت بە هێمنی و بێ شڵەژان هەڵسوکەوت بکەین، چونکە خەونی وا هەیە دیمەنەکەی ترسناك و تۆقێنەرە، بەڵام واتاکەی جوان دەردەچێت.

بەگشتی زۆر کەس ناتوانن خەون و ماناکەی لەیەك جیا بکەنەوە، بۆیە پێویست ناکات لە هیچی خۆڕایی خۆت خەمبار بکەیت و زۆر بیری لێ بکەیتەوە.

– ئەی چی بکەین؟ چۆن هەڵسوکەوت بکەین؟

– ئەمە ئاسانە.

کاتێك کە خەونێکی خۆش دەبینیت، بۆ دایکت یا باوکت یان گەورەیەکی بگێڕەوە و، داوای لێکدانەوەکەی بکە، تا ناخت ئارام ببێتەوە.

* * *

پێغەمبەرمان ﷺ خەونی زۆر خۆشی دەبینی و، کاتی نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵانی دەگێڕایەوە.

هاوەڵانیش ئەو خەونانەی کە دیبوویان بۆ پێغەمبەریان ﷺ دەگێڕایەوە و داوای خەوپرژێنییان لێ دەکرد، واتە واتای خەونەکەیان بۆ لێك بداتەوە.

پێغەمبەریش ﷺ خەونەکانی وەك خۆی بۆ لێك دەدانەوە و، دواتر وەك ڕۆژی ڕووناك دەهاتە دی.

* * *

جوانترین لێکدانەوەی خەونیش لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە، کاتێك حەزرەتی یوسف (سەلامی خوای لێ بێت) منداڵ دەبێت خەونێك دەبینێت و، خەونەکەی بۆ باوکی دەگێڕێتەوە:

(باسی ئەوە بکە کە یووسف بە یەعقووبی باوکی وت: بابە من یازدە ئەستێرەم لە خەودا چاوپێ کەوت لەگەڵ خۆر و مانگدا، چاوم پێ کەوتن سوجدەیان بۆ ئەبردم.

یەعقووبیش لە وەڵامدا وتی: کوڕە بچکۆلانەکەم! ئەم خەوەت بۆ براکانت مەگێڕەوە؛ نەبادا مەعنای خەوەکەت بزانن و بەخیلیت پێ ببەن و، فێڵێکت لەگەڵ بکەن کە زیانت پێ بگەیێنن. بێگومان شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئینسان و لەوانەیە وەسوەسە بخاتە دڵی براکانتەوە و دەستت لێ بوەشێنن.

ئا وەها خودا هەڵتئەبژێرێت و مەعنای قسە گرانەکانی کتێبەکانی خۆی و قسەی حەکیمان و خەوبینین و شتی ترت فێرئەکات و نیعمەتی خۆیت بۆ تەواو ئەکات، هەم پێغەمبەری و هەم موڵك و دارایی و دەستەڵات بۆ تۆ و بۆ ئالی یەعقووب، هەروەك نیعمەتی گەورەی پێغەمبەرایەتی و جێگە و ڕێگەی پێش تۆ بۆ ئیبراهیم و

ئیسحاقی باپیرت، تەواوکرد. بەڕاستی خودای پەروەردگاری تۆ زانایـە و کارەکانی پڕ حیکمەتن) یوسف:٤-٦.

حـــەزرەتی یوســـفیش (ســـەلامی خـــوای لـــێ بێـــت) خەونلێکدەرەوەیـەکی یـەکجار بـەتوانا بـوو، هـەر خـەونێکی لێـك بدایەتەوە بە تێپەڕبوونی کات وەکو خۆی دەردەچوو.

* * *

لە ڕاستیدا بەخەون کار ناکرێت و، بە گـوێرەی خەونـەکان کـار و کـردەوە ئـەنجام نادرێـت، چـونکە خـەون حـوکمێکی ئـایینی لـە خـۆ ناگرێت.

لەبەر ئەمە نابێـت مـرۆڤ، هەڵسـوکەوتی بـەپێی خەونـەکانی ڕێـك بخات.

خەونـــە خۆشـــەکان تـــەنها مـــژدە و ئومێـــد و، ترووســـکەیەکی ڕۆشنایین بەرەو داهاتوو و، سەرچاوەیەکی خۆشحاڵکردنن.

بـەڵام جـاری وا هەیـە خـودا بـە نسـیبمان دەکـات و پێغەمبـەری نازدارمان ﷺ لە خەونماندا دەبینین، ئەم جۆرە خەونە بـە تـەواوەتی ڕاستە و، هیچ ئاڵۆزی و هەڵەیەکی تێدا نییە.

لەم بارەیەوە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێت:

"هەرکـەس مـنی لەخەونـدا بینی، ئـەوا بەڕاسـتی مـنی بینیـوە؛ چونکە شەیتان ناتوانێت لە شێوەی مندا بچێتە خەونی کەسەوە".

لەبەر ئەمە خۆشترین و، جوانترین و، شیرینترین و، تەواوترین خەون، ئەوەیە کە خەون بە پێغەمبەرەوە ﷺ ببینین.

بۆیە دەبێت نزا بکەین خوای گەورە ئەم جۆرە خەونە شیرینەمان بە نسیب بکات.[1]

---

١- لە (مەکتووبی بیست و هەشتەم)ەوە وەرگیراوە.



## کێ ئەم بوونەوەرە ناسکانەی بەم ڕەنگاوڕەنگییە نەخشاندووە؟

ڕۆژێکی خۆشی بەهار...

وەرزێك، کە گوڵە کێوی و خۆڕسکەکان وەك تارایەك زەوییان ڕازاندبووەوە.

ڕۆژێکی خۆرەتاو کە دەشت و کێو یەکپارچە سەوز داهاتبوون لە ماڵ چوومە دەرەوە، بۆ ئەوەی بۆنی بەهار بکەم.

خۆم لەناو گوڵە ڕەنگا و ڕەنگ و شێوە هەمەڕەنگ و ئاڵا و واڵاکاندا بینیەوە. بەڕاستی دیمەنی بەشەوق و زەوقی ڕەنگەکان، هەر لە سەوز و سوورەوە تا شین و پەمەیی و هەموو ڕەنگەکانی دیکەی پەلکەزێڕینە مرۆڤیان مەست دەکرد.

کرانەوەی گوڵی هەر درەختێك بە جۆرێکە و، گەڵاکانی جۆرێکی ترن، هەر یەك لە ڕەنگەکانیش لە جوانیی و گەشیی و بریقەیاندا لە یەکتری جیاواز بوون.

زۆر گەڕام و بە ناویاندا پیاسەم کرد و، تەماشای سروشتی ناوازە و دڵڕفێنم کرد و، سەرنجم لە نیگاری جوان و دڵڕفێنی بەهار دا...

هەموو ڕووەك و گوڵەکان هێندە ناسك و تەڕ و گەش و پاراو بوون کە بوێریم نەدەکرد دەستیان بۆ بەرم، بۆیە پڕ بە سینە و دڵم بە بۆن و بەرامەی گوڵەکان خۆم مەست کرد.



تەماشای ڕاست و چەپ و دەوروبەری خۆم دەکرد و، بیرم لەو زاتە هونەرمەندە دەکردەوە کە ئەم گوڵ و دار و درەخت و گیا و نەمامەی ڕەنگ کردووە، ئەو زاتەی بەم نەخش و نیگار و هونەرمەندییە ئەم بوونەوەرە ناسکانەی بەدیهێناوە، ئەو زاتەی ئەو نەمامە تەڕ و پاراو و سەوزانەی لەو خاکە وشك و ڕەقەوە دەرهێناوە!

ئای! چۆن کەمەندکێشی ئەم خەیاڵانەم بووبووم.. چ کەشێکی سەرسوڕهێنەر و ناوازە و لێوان لێو لە جوانی و ڕامان بوو!

هەموو ئەمەش دەرەنجامی ئەو هەستانەم بوو کە لە ئێوارە کۆڕێکدا لام گەڵاڵە بوو..

لەو کۆڕەدا مامۆستایەکی گەنج پەرتووکێکی گەورەی بەرگ سووری[1] پێبوو، دەستی کرد بە خوێندنەوەی. هێندە لە بابەتەکەدا ڕۆچووبوو، دەتوت لەنێو ئەو گوڵانەدا دانیشتووە کە باسمان کرد، نەك لەو ژوورەدا کە کۆڕەکەی لێ بەسترا بوو!

لە خوێندنەوە و شیکردنەوەی بابەتەکانی کتێبەکە بەردەوام بوو:

هەموو ڕووەکێك، لە کاتی پشکوتنیدا، بە پەخشکردنی خۆشی و جوانی، مەعنەویەن قسە دەکەن.

بە زمانی حاڵ دەڵێن ئەوان:

ئاوێنەیەکن و، ڕەنگدانەوەی جوانی و ناوازەیی ئەو زاتەن کە بەو شێوەیە نەخشاندوونی.

هەر لە گوڵە زەرد و سوور و سەوزەکانیانەوە بیگرە تا پەمەیی و مۆر، هەموویان دەیانەوێت بڵێن سەرچاوەی ڕەنگەکانیان ئەو خاکە بێگیان و بێ ڕۆح و بێ هەستە نییە کە تێیدان.

هەموو گوڵێك بە زمانی جوانی خۆیان شتێك بە گوێی تەماشاکەرەکەیاندا دەچرپێنن...

---

[1]- مەبەست لەم کتێبە گەورە بەرگ سوورە (پەیامەکانی نوور)ی مامۆستا (سەعیدی نوورسی)یە.

له درێـژەی کۆڕەکـەدا یـەکێکی تـر لـە ئامـادەبووان درێـژەی بـە باسەکە دا:

وەرن بـا تەماشـای دارێـك بکـەین! لـە وەرزی بـەهاردا چـۆن بـە گـەڵای سـەوز و ناسـك خـۆی دەپۆشـێت، پاشـان بـە پێوانەیـەکی دیـاریکراو بـە چـرۆ خـۆی دەڕازێنێـەوە و، دوای ماوەیـەکیش خـوای گەورە بە حیکمەت و بەزەیی خۆی لەو گوڵانەوە میوەی تەڕ و پاراو و شـیرین و بەلـەزەت بەرهـەم دەهێنێـت، تـا ئێمـە بـە تـام و بـۆن و ڕەنگەکانی ئەم هەموو جۆرە بەرهەمە سەرسام بکات.

هـەموو گوڵـەکان بـە زمـانی حـاڵ و، بـە ڕووخسـار و شـێوەی سەرسوڕهێنەریان یادی ناوەکانی خوای بەدیهێنەریان دەکەن و، ئێمـە بە خالقی کاربەجێمان دەناسێنن.[1]

---

١– له (وتەی سی و سێیەم)ەوە وەرگیراوە.




# باپیره نوور

## فێرمان دەكات

### كتێبی یەكەم

(باپیره نوور) له ماوەی نەوەد ساڵی تەمەنیدا لـه هـەموو پـەرتووك و نووسـراو و وانەكانیـدا تـەنها لەسـەر یـەك بابـەت ڕاوەسـتاوه، ئـەویش (ئیمان)ه.

– ئیمان چییه؟

– ئێمه چۆن بە ڕامان و بیركردنەوه له بوونەوەران بەدیهێنەرمان بناسین؟

– چۆن لەناوه پیرۆزەكانی خوای گەوره وردبینەوه و لێیان تێ بگەین؟

–چۆن بتوانین پەروەردگارمان بناسین و باوەڕی پێ بهێنین؟

– به چ شێوازێك له قورئان بڕوانین و لێی تێ بگەین؟

– پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) چیمان فێردەكەن؟

– بەهەشت و دۆزەخ چین؟

– مرۆڤ بۆ چ مەبەستێك لەم دنیایەدا بـەدیهێنراوه؟ ئەركـەكانی سەرشـانی كامانەن؟

– چۆن خودا بپەرستین؟ بۆچی دەبێت ملكەچی بڕیار و فەرمانەكانی خودا بین؟

هەوڵمانـداوه بـه سـاناترین شـێوه وەڵامـی ئـەم پرسـیاره هـەره گرنگانەتان بدەینەوه و، سوودێك به ئێوەی خوێنەری بەڕێز بگەیەنین...




# باپیره نوور

## فێرمان دەکات

### کتێبی دووەم

وانە شیرینەکانی (باپیرە نوور) سەرنجی منداڵ و گەنج و پیر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، لەبەر ئەوەی کە تەنانەت بابەتە هەرە سەخت و ئاڵۆزەکانی بە شێوازێکی سادە باسکردووە، ئەمەش وایکردووە هەموومان لێی تێبگەین و، زۆر حەز بە وانەکانی بکەین.

هەربۆیە (پەیامەکانی نوور) ی (باپیرە نوور) لای هەمووان زۆر پەسەند و خۆشەویستە و، زۆریش خوێندراوەتەوە..

بە گشتی (باپیرە نوور) لە هەموو کتێبەکانیدا و، لە بەرهەم و نووسراوەکانیدا و، لە سەرجەم وانەکانیدا لەسەر یەك بابەت زۆر وەستاوە و باسی کردووە، کە ئەویش (ئیمان)ە.

لەم پەرتووکەشدا، ئەو بابەتانە باسکراون کە پەیوەستن بە (ئیمان)ەوە.

– (ئیمان) چۆن نوێ دەبێتەوە؟

– چەند جۆر سوپاسگوزاریی هەیە؟

– مردن چ جوانییەکی تێدایە؟

ئەم کتێبەش هەروەك کتێبەکەی پێشوو، بە خۆشەویستییەوە بخوێننەوە، تا ببێتە ڕابەری ژیانتان.




# باپیره نوور فێرمان دەكات

## كتێبی سێیەم

وانە شیرینەكانی (باپیره نوور) سەرنجی منداڵ و گەنج و پیر بۆ لای خۆی ڕادەكێشێت، لەبەرئەوەی كە تەنانەت بابەتە هەرە سەخت و ئاڵۆزەكانی بە شێوازێكی سادە باس كردووە، ئەمەش وایكردووە هەمووومان لێی تێبگەین و، زۆر حەز بە وانەكانی بكەین.

هەربۆیە (پەیامەكانی نوور)ی (باپیره نوور) لای هەمووان زۆر پەسەند و خۆشەویستە و، زۆریش خوێندراوەتەوە..

بەگشتی (باپیره نوور) لە هەموو كتێبەكانیدا و، لە بەرهەم و نووسراوەكانیدا و، لە سەرجەم وانەكانیدا لەسەر یەك بابەت زۆر وەستاوە و باسی كردووە، كە ئەویش (ئیمان)ە.

لەم پەرتووكەشدا (باپیره نوور) لەسەر ڕوونكردنەوە و باسكردنی (ئیمان) بۆ مرۆڤەكان بەردەوامە.

ئەم پەرتووكەش، وەك پەرتووكەكانی دیكە، بە خۆشەویستی و پەند لێ بینینەوە بخوێننەوە، تا ببێتە ڕابەری ژیانتان.




## باپیره نوور
## فێرمان دەکات

### کتێبی چوارەم

وانه شیرینەکانی (باپیره نوور) سەرنجی منداڵ و گەنج و پیر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، لەبەرئەوەی کە تەنانەت بابەتە هەرە سەخت و ئاڵۆزەکانی بە شێوازێکی سادە باس کردووە، ئەمەش وایکردووە هەموومان لێی تێبگەین و، زۆر حەز بە وانەکانی بکەین.

هەربۆیە (پەیامەکانی نوور)ی (باپیره نوور) لای هەمووان زۆر پەسەند و خۆشەویستە و، زۆریش خوێندراوەتەوە..

بەگشتی (باپیره نوور) لە هەموو کتێبەکانیدا و، لە بەرهەم و نووسراوەکانیدا و، لە سەرجەم وانەکانیدا لەسەر یەك بابەت زۆر وەستاوە و باسی کردووە، کە ئەویش (ئیمان)ە.

لەم پەرتووکەشدا ئەم بابەتانە باسکراون کە پەیوەستن بە (ئیمان)ەوە:

– چۆن بتوانین تەمەنمان درێژ بکەینەوە؟ بەهەشت چەندێك هەرزانە. حەزرەتی ئادەم چۆن لە بەهەشت دەرکرا؟ ئایا خزری پیاوچاك دەژی؟ بۆچی دەترسین؟ خەون چۆن لێکدەدرێتەوە؟

ئەم پەرتووکەش، وەك پەرتووکەکانی دیکە، بە خۆشەویستی و پەند لێ بینینەوە بخوێننەوە، تا ببێتە ڕابەری ژیانتان.

# پێڕست

# NUR DEDE ANLATIYOR

MEHMED PAKSU













زنجیرەی
**(باپیرە نوور فێرمان دەكات)**
چەند كتێبێكە بۆ
تێگەیاندنی منداڵان لە
بنەما سەرەكییەكانی
(باوەڕ) و، لێوانلێوە لە
وەڵامی ئەو پرسیارانەی بە
خەیاڵی هەموو منداڵێكدا
دێت و دایكان و باوكان
زۆبەی كات لەئاستیدا
دۆش دادەمێنن.






ناوەندی راگەیاندنی ئارا
www.aramediacenter.com
info@aramediacenter.com

0-0193-0000-X
9 780019 300001

نرخی (٤٠٠٠) دینارە